**٧٤٠٢- کەسانێك خۆزگە دەخوازن گوناهیان زۆرتر بکردایە ،ئەوانەی خوای گەورە خرا پەکانیانی بۆ گۆڕین بە چاکە .**

( الصحيحة ٢٠٧٧ )

٧٤٠٣- من تاب إلى الله قبل أن يغرغر قبل الله منه.

( صحيح ) ( ك ) عن رجل.

**٧٤٠٣- هەرکەسێك تەوبە بکات پێش گیانەلا.خوای گەورە لێی وەردەگرێت .**

( الترغيب ٣١٤٣ )

٧٤٠٤- من تاب قبل أن تطلع الشمس من مغربها تاب الله عليه.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٤٠٤- هەرکەسێك تەوبە بکات پێش هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە ،خوای گەورە لێی وەردەگرێت .**

( المشكاة ٢٣٣١ )

٧٤٠٥- الندم توبة.

( صحيح ) ( حم تخ هـ ك ) عن ابن مسعود ( ك هب ) عن أنس.

**٧٤٠٥- پەشیمانی تەوبەیە .**

( الروض ٦٤٢ )

٧٤٠٦- الندم توبة و التائب من الذنب كمن لا ذنب له.

( صحيح ) ( طب حل ) عن أبي سعيد الأنصاري.

**٧٤٠٦- پەشیمان بوونەوە تەوبە کردنە ،ئەو کەسەش لە دوای گوناهێك تەوبە دەکات وەکو ئەوە وایە هەرگوناهی نەبووبێت .**

( الضعيفة ٦١٥ )

٧٤٠٧- و الذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم و لجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله فيغفر لهم.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٧٤٠٧- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ،ئەگەر گوناهتان نەکردایە ،خوای گەورە ئێوەی دەبردەوە و ،کەسانێکی دەهێنا گوناە بکەن و ،داوای لێخۆش بوون لە خوا بکەن و ئەویش لێیان خۆش بێت .**

( الصحيحة ١٩٥٠ )

٧٤٠٨- و الله لله أشد فرحا بتوبة عبده من رجل كان في سفر في فلاة من الأرض فأوى إلى ظل شجرة فنام تحتها و استيقظ فلم يجد راحلته فأتى شرفا فصعد عليه فلم ير شيئا ثم أتى آخر فأشرف فلم ير شيئا فقال: أرجع إلى مكاني الذي كنت فيه فأكون فيه حتى أموت فذهب فإذ براحلته تجر خطامها فالله أشد فرحا بتوبة عبده من هذا براحلته.

( صحيح ) ( حم م ) عن النعمان بن بشير.

**٧٤٠٨- سوێند بە خوا خوای گەورە پێخۆش حاڵترە بە تەوبەکردنی بەندەکەی لە پیاوێك لە گەشتێکدا بوو لە بیابانێکداو ، پەنای بردە بەر سێبەری دارێك ،وە لەژێریدا خەوت ،کە بێدار بوویەوە ،وڵاخەکەی نەمابوو ،ئەویش چووە سەر بەرزاییەك و هیچی نەبینی ،ئینجا چووە سەر بەرزاییەکی ترو هیچی نەبینی ،ئینجا وتی : ئەگەڕێمەوە جێگاکەی خۆم کە لێیەوەهاتم و ،لەوێ دەبم تاکو دەمرم ،ڕۆیشت و لەوێ وڵاخەکەی دۆزییەوە ،ڕەشمەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا ،خوای گەورە بە تەوبەکردنی بەندەکەی خۆشحاڵترە لەو پیاوە بە دۆزینەوەی وڵاخەکەی .**

( الترغيب ٣١٥٥ )

٧٤٠٩- لا تنقطع الهجرة حتى تنقطع التوبة و لا تنقطع التوبة حتى تطلع الشمس من مغربها.

( صحيح ) ( حم د ) عن معاوية.

**٧٤٠٩- کۆچکردن نابڕێتەوە ،تاکو تەوبەکردن نەبڕێتەوە ،تەوبە کردنیش نابڕێتەوە تاکو خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵنەیەت .**

( الارواء ٤٤٩ )

٧٤١٠- يتنزل ربنا تبارك و تعالى كل ليلة إلى السماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر فيقول: من يدعوني فأستجيب له ؟ من يسألني فأعطيه ؟ من يستغفرني فأغفر له ؟.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة.

**٧٤١٠- پەروەردگارمان هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ،كاتێك سێیەكی كۆتایی شەو دەمێنێت و ،دەفەرموێت : كێ لێم دەپاڕێتەوە با لێی وەرگرم و ،كێ داوای شتم لێدەكات با پێی ببەخشم و ،كێ داوای لێخۆش بوونم لێ دەكات با لێی خۆش بم .**

( الارواء٤٤٩ )

٧٤١١- يقول الله تعالى: من عمل حسنة فله عشر أمثالها و أزيد و من عمل سيئة فجزاؤها مثلها أو أغفر و من عمل قراب الأرض خطيئة ثم لقيني لا يشرك بي شيئا جعلت له مثلها مغفرة و من اقترب إلي شبرا اقتربت إليه ذراعا و من اقترب إلي ذراعا اقتربت إليه باعا و من أتاني يمشي أتيته هرولة.

( صحيح ) ( حم م هـ ) عن أبي ذر

**٧٤١١- خوای گەورە دەفەرموێت : هەركەسێك چاكەیەك بكات ،دە بەرانبەرو زیاتری پاداشت دەدرێتەوە ،هەركەسیش خراپەیەك بكات وەكو خۆی پاداشتی دەدەمەوە یان لێی خۆش دەبم ،هەركەسیش ئەوەندەی پڕاوپڕی زەوی سەر زەوی خراپە بكات بە بێ هاوبەش دانان پێم بكات ئەوەندەی لێخۆش بوونی پێ دەبەخشم ،هەركەسیش بستێك لەمن نزیك بێتەوە ، باڵێك لێی نزیك دەبمەوە ،هەركەسیش ( باڵێك ) گەزێك لێم نزیك بێتەوە ، شاباڵێك لێی نزیك دەبمەوە ، هەركەسیش بە ڕۆیشتن بێت بۆ لام ،بە هەڵە داوان دەچم بەرەو پیری .**

( الصحيحة ٥٨١ )

٧٤١٢- ينزل الله تعالى إلى السماء الدنيا كل ليلة حين يمضي ثلث الليل الأول فيقول: أنا الملك أنا الملك من ذا الذي يدعوني فأستجيب له ؟ من ذا الذي يسألني فأعطيه ؟ من ذا الذي يستغفرني فأغفر له ؟ فلا يزال كذلك حتى يضيء الفجر.

( صحيح ) ( م ت ) عن أبي هريرة.

**٧٤١٢- خوای گەورە هەمووشەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ،كاتێك سێ یەكی یەكەمی شەو تێدەپەڕێت و ،دەفەرموێت : من پادشام ،من پادشام ، ئەوە كێ یە لێم دەیەوێت بپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە ؟كێ داواكاری هەیە بۆی جێ بە جێ بكەم ؟ كێ داوای لێخۆش بوونم لێ دەكات لێی خۆش بم ؟ هەر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە تا ڕۆژ دەبێتەوە .**

( الارواء ٤٤٩)

٧٤١٣- ينزل الله تعالى في السماء الدنيا لثلث الليل الآخر فيقول: من يدعوني فأستجيب له أو يسألني فأعطيه ثم يبسط يديه يقول: من يقرض غير عديم و لا ظلوم

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة

**٧٤١٣- خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا لە سێ یەکی کۆتایی شەودا و ، دەفەرموێت : کێ لێم دەپاڕێتەوە با وەڵامی بدەمەوە ،یان داوام لێ دەکات پێی ببەخشم ؟ ئینجا دەستی دەکاتەوەو دەفەرموێت : کێ قەرز دەدات بە کەسێك کە بێ نیازەو ، ستەمکاریش نییە .**

( الارواء ٤٤٩ )

٧٤١٤- ينزل الله في كل ليلة إلى سماء الدنيا فيقول: هل من سائل فأعطيه ؟ هل من مستغفر فأغفر له ؟ هل من تائب فأتوب عليه ؟ حتى يطلع الفجر.

( صحيح ) ( حم ن ) عن جبير بن مطعم.

**٧٤١٤- خوای گەورە لە هەموو شەوێکدا دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا و دەفەرموێت : ئایا کەس داواکاری هەیە پێی ببەخشم ؟ ئایا کەسێك داوای لێ خۆش بوون دەکات تا لێی خۆش ببم ؟ ئایا کەسێك تەوبە دەکات تا لێی وەرگرم ؟ هەتا بەرەبەیان .**

( الارواء ٤٤٩ )

٧٤١٥- إذا رأيت الله تعالى يعطي العبد من الدنيا ما يحب و هو مقيم على معاصيه فإنما ذلك منه استدراج.

( صحيح ) ( حم طب هب ) عن عقبة بن عامر .

**٧٤١٥- ئەگەر بينيت خوای گەورەت لە دونيادا بەشی بەندەکەی پێی خۆشە دەداتێ لە کاتێکدا ئەویش هەر بەردەوامە لەسەر تاوان کردن ،ئەوە وردە وردە ڕای دەکێشێت بۆ سزادان .**

( الصحيحة ٤١٣ )

٧٤١٦- أمسك عليك بعض مالك فهو خير لك.

( صحيح ) ( ق ٣ ) عن كعب بن مالك .

**٧٤١٦- هەندێك لە ماڵەکەت بۆ خۆت گلدەرەوە ،وا باشترە .**

( المشكاة ٣٤٣٤ )

٧٤١٧- قالت الملائكة: يا رب ذاك عبدك يريد أن يعمل بسيئة و هو أبصر به فقال: ارقبوه فإن عملها فاكتبوها له بمثلها و إن تركها فاكتبوها له حسنة إنما تركها من جراي.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٧٤١٧- فریشتەکان وتیان : ئەی پەروەدرگار ئەوە بەندەیەکتە ئەیەوێت خراپەیەك بکات چاکیش دەزانێت خراپەیە ، خوای گەورە دەفەرموێت چاودێری بکەن ، ئەگەر کردی وەکو خۆی بۆی بنوسن ئەگەر وازیشی لێهێنا بە چاکەیەك بۆی بنوسن ، چونکە لە پێناوی من وازی لێهێنا .**

( الترغيب ٣٣٧٥ )

٧٤١٨- ما من عبد مؤمن إلا و له ذنب يعتاده الفينة بعد الفينة أو ذنب هو مقيم عليه لا يفارقه حتى يفارق الدنيا إن المؤمن خلق مفتنا توابا نسيا إذا ذكر ذكر.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٧٤١٨- هیچ بەندەیەکی باوەڕدار نیە گوناهێکی نەبێت کە ، ناو بەناو بیکات ، یان گوناهێکی هەیە بەردەوام دەیکات تاکو لە دونیا دەردەچێت ، باوەڕدار بەو شێوەیە دروستکراوە کە دڵی ئالودە دەبێت وتەوبە دەکات و لەبیری دەچێتەوە ، ئەگەر بیری بخرێتەوە بیری دێتەوە .**

( الصحيحة ٢٢٧٧ )

٧٤١٩- من استغفر للمؤمنين و للمؤمنات كتب الله له بكل مؤمن و مؤمنة حسنة.

( صحيح ) ( طب ) عن عبادة.

**٧٤١٩- هەرکەسێك داوای لێخۆش بوون بۆ پیاو ئافرەتانی بڕوادار بکات ، خوای گەورە بەهەر یەکێك لەو کەسانە چاکەیەکی بۆ دەنووسێ .**

# بابەتی سۆزو بەزەیی

٧٤٢٠- أوأملك لك أن نزع الله من قلبك الرحمة ؟.

( صحيح ) ( حم ق هـ ) عن عائشة .

**٧٤٢٠- چیم پێ دەكرێت[1] بۆت كە خوای گەورە بەزەیی لە دڵت داڕنیوە[2]**

( المشكاة ٤٩٤٨ )

٧٤٢١- الراحمون يرحمهم الرحمن تبارك و تعالى: ارحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء.

( صحيح ) ( حم د ت ك ) عن ابن عمرو زاد ( حم ت ك ) : والرحم شجنة من الرحمن فمن وصلها وصله الله ومن قطعها قطعه الله.

**٧٤٢١- خاوەن بەزەییەكان خوای گەورە بەزەیی پیایاندا دێتەوە ، بەزەییتان بە خەڵكی سەر زەویدا بێتەوە ،بەڵكو ئەوی لە ئاسمانە بەزەیی پێتاندا بێتەوە .**

( الصحيحة ٩٢٤ )

٧٤٢٢- قد رحمها الله تعالى برحمتها ابنيها.

( صحيح ) ( طس ) عن الحسن بن علي مرسلا.

**٧٤٢٢- بەڕاستی خوای گەورە بەزەیی پیاهاتەوە ،كە ئەو بەزەیی بە دوو منداڵەكەیدا هاتەوە .**

( الروض ٢٩٠ )

٧٤٢٣- من لا يرحم الناس لا يرحمه الله.

( صحيح ) ( حم ق ت ) عن جرير ( حم ت ) عن أبي سعيد.

**٧٤٢٣- هەركەس بەزەیی بە خەڵكدا نەیەتەوە ، خوای گەورە بەزەیی پێیدا نایەتەوە .**

(صحيح الترمذي ١٩٢٢ )

٧٤٢٤- هذه رحمة يجعلها الله في قلوب من يشاء من عباده و إنما يرحم الله من عباده الرحماء.

( صحيح ) ( حم ق د ن هـ ) عن أسامة بن زيد.

---

[1] (ابن حجر ) دەڵێت : واتە هیچم پێناكرێ بۆ تۆ و هیچیان لە دەست نایەت .

[2] بە پیاوێكی فەرموو كە وتی : دە مناڵم هەیە هیچیانم ماچ نەكردووە .

**٧٤٢٤- ئـەوە ميهرەبانيەكـە خـواى گـەورە دەيخاتـە دڵـى هەركەسێك كـە بيـەوێت لـە بەندەكانى ، خواى گەورەيش بەزەيى بە بەندە خاوەن بەزەييەكانيدا دێتەوە .**

( الجنائز ١٦٤ )

٧٤٢٥- إذا سافرتم في الخصب فأعطوا الإبل حظها من الأرض و إذا سافرتم في السنة فأسرعوا عليها السير و إذا عرستم بالليل فاجتنبوا الطريق فإنها طرق الدواب و مأوى الهوام بالليل.

( صحيح ) ( م د ت ) عن أبي هريرة .

**٧٤٢٥- ئەگـەر گەشـتان كـرد لـە زەويـەكى بە پيتـدا ،مـافى وشـترەكەى بـدەن بـۆ لـەوەڕ خواردن ،ئەگەر لـە سـاڵى نـەهات و وشكيدا گەشـتتان كـرد ، پەلـەى لـێ بكـەن ،ئەگـەر بەشەويش لاتـاندا دووركەونەوە كە نزيكى سەر ڕێگا ، چـونكە ئـەوە ڕێگـاى گيانلەبـەرو و پەنـاگەى زيندەوەرە بەشەو .**

( الصحيحة ١٣٥٧ )

٧٤٢٦- إذا سرتم في أرض خصبة فأعطوا الدواب حظها و إذا سرتم في أرض مجدبة فانجوا عليها و إذا عرستم فلا تعرسوا على قارعة الطريق فإنها مأوى كل دابة.

( صحيح ) ( البزار ) عن أنس .

**٧٤٢٦- ئەگەر بە زەوييەكى بە پيتدا تێپەڕين مافى ولاَخەكانبدەن لە لەوەڕ ،ئەگـەر بـە خاكێى وشكدا تێپەڕين بە پەلە بڕۆن ،ئەگەر بـارتـان خست لەسەر ڕێگە لامەدەن ، چونكە ئەوە پەنـاگەى هەموو گيانەوەرێكە .**

( الصحيحة ١٣٥٧ )

٧٤٢٧- أرحم من في الأرض يرحمك من في السماء.

( صحيح ) ( طب ) عن جرير ( طب ك ) عن ابن مسعود .

**٧٤٢٧- بەزەيت بەوەدا بێتەوە كە لەسەر زەوييە ،با ئەوەى لە ئاسمانە بەزەيى پيێتا بێتەوە.**

( الصحيحة ٩٢٥ )

٧٤٢٨- ارحموا ترحموا و اغفروا يغفر لكم ويل لأقماع القول ويل للمصرين الذين يصرون على ما فعلوا و هم يعلمون

( صحيح ) ( حم خد هب ) عن ابن عمرو .

**٧٤٢٨- بەزەییتان هەبێت با ڕەحمتان پێبکرێت ،ببورن بەڵكو خوا بتان بورێت ،واوەیلا بۆ ئەو كەسانەی قسەی شەرع بە بێ هودە وەردەگرن [1] ، هاوار بۆ ئەو كەسانەی سوورن لەسەر كردەوەكانیان و بە خرا پیشی دەزانن .**

( الصحيحة ٤٨٢ )

٧٤٢٩- إنما يرحم الله من عباده الرحماء.

( صحيح ) ( طب ) عن جرير .

**٧٤٢٩- لە ڕاستیدا خوای گەورە تەنها بەزەیی دێتەوە بە خاوەن بەزەییەكاندا .**

( الضعيفة ٣٢٢٥ )

٧٤٣٠- خاب عبد و خسر لم يجعل الله تعالى في قلبه رحمة للبشر.

( صحيح ) ( الدولابي في الكنى أبو نعيم في المعرفة ابن عساكر ) عن عمرو بن حبيب .

**٧٤٣٠- داماو خەسارۆمەندە كەسێك خوای گەورە بەزەیی نەخستبێتە دڵیەوە لە مرۆڤەكان .**

( الصحيحة ٤٥٦ )

٧٤٣١- من لم يرحم صغيرنا و يعرف حق كبيرنا فليس منا.

( صحيح ) ( خد د ) عن ابن عمرو.

**٧٤٣١- هەركەس بەزەیی نەیەتەوە بە بچووكمانداو مافی گەورەمان نەزانێت ، لە ئێمە نیە .**

( صحيحة ابی داود ٤٩٤٣ )

٧٤٣٢- من لا يرحم لا يرحم

( صحيح ) ( حم ق د ت ) عن أبي هريرة ( ق ) عن جرير

**٧٤٣٢- هەركەس بەبەزەیی نەبێت ،میهرەبانی دەربارە ناكرێت .**

( مشكلة الفقر ١٠٨ )

٧٤٣٣- من لا يرحم لا يرحم و من لا يغفر لا يغفر له

( صحيح ) ( حم ) عن جرير

**٧٤٣٣- هەركەس بەزەیی نەبێت ڕەحمی پێناكرێت ،هەركیەسیش لێبووردە نەبێت وە بەر لێبوردەیی ناكەوێت .**

( الصحيحة ٤٨٣ )

---

[1] ( الأقماع ) واتە : ئەوانە گرنگی بە شت نادەن،بەبێ هودە سەبری شت دەكەن دونیا بە هاوانتە دەگرن ـ یان كە دەخۆن تێر نابن كەماڵیش كۆدەكەنەوە چاویان تێر نابێ . النهاية في غريب الحديث و الاثر ج٢ ص٤٩ ط٣ .

٧٤٣٤- من لا يرحم لا يرحم و من لا يغفر لا يغفر له و من لا يتب لا يتب عليه.

( صحيح ) ( طب ) عن جرير.

**٧٤٣٤- هەرکەس بەزەیی نەبێت میهرەبانی لەگەڵدا ناکرێت ،هەرکەسیش لێبووردەی نەبێت وە بەر لێبووردەیی ناکەوێت ، هەرکەسیش تەوبە نەکات تەوبەی وەرناگیرێت .**

( الصحيحة ٤٨٣ )

٧٤٣٥- لا تنزع الرحمة إلا من شقي.

( صحيح ) ( حم د ت حب ك ) عن أبي هريرة.

**٧٤٣٥- بەزەیی لە دڵی کەس دەرناکرێت ،تەنها خراپەکار نەبێت .**

( المشكاة ٤٩٦٨ )

٧٤٣٦- كان أرحم الناس بالصبيان و العيال.

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن أنس.

**٧٤٣٦- پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەسێك بەسۆز تربوو بەرانبەر منداڵ و ئەوانەی بەخێوی دەکرێن.**

( الصحيحة ٢٠٨٩ )

٧٤٣٧- و الشاة إن رحمتها يرحمك الله.

( صحيح ) ( طب ) عن قرة بن إياس ومعقل بن يسار.

**٧٤٣٧- ئەگەر بەزەیت بە مەڕیکیشدا بێتەوە خوای گەورە بەزەیی پێتا دێتەوە .**

( الصحيحة ٢٦ )

## بابەتی بەزەیی هاتنەوە

٧٤٣٨- إن الله حين خلق الخلق كتب بيده على نفسه: إن رحمتي تغلب غضبي.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة .

**٧٤٣٨- بەڕاستی خوای گەورە کاتێك دروستکروەکانی درووست کرد بەدەستی خۆی لەسەر خۆی نووسی کە میهرەبانیم زاڵە بەسەر تووڕەییمدا .**

( الصحيحة ١٦٢٩ )

٧٤٣٩- إن الله تعالى خلق الرحمة يوم خلقها مائة رحمة فأمسك عنده تسعا و تسعين رحمة و أرسل في خلقه كلهم رحمة واحدة فلو يعلم الكافر بكل الذي عند الله من الرحمة لم ييأس من الجنة و لو يعلم المؤمن بالذي عند الله من العذاب لم يأمن من النار.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة .

**٧٤٣٩- خوای گەورە لەو ڕۆژەی بە زەیی درووستی کرد بەسەد میهرەبانی دروستی کرد ،ئەوەدو نۆی لەلای خۆی هێشتەوە و، لەنێو هەموو درووستکراوەکانیشیدا یەك پلە بەزەیی بلاو کردووەتەوە ،ئەگەر بێباوەڕ ئەو هەموو میهرەبانیەی خوای بزانیایە نا ئومێد نەدەبوو لە بەهەشتا ،ئەگەر ئیمانداریش ئاگادار بووایە لەو سزایەی هەیە لەلای خوا دڵنیا نەدەبوو لە دۆزەخ .**

( الصحيحة ١٦٣٣ )

٧٤٤٠- إن الله خلق مائة رحمة رحمة منها قسمها بين الخلائق و تسعة و تسعين إلى يوم القيامة.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس .

**٧٤٤٠- خوای گەورە سەدڕەحمەتی درووست کردووە و ،یەك ڕەحمەتی دابەشکردووە لە نێو درووستکراوەکانیدا و ،ئەوەدو نۆی داناوە بۆ ڕۆژی قیامەت .**

( الصحيحة ١٦٣٤ )

٧٤٤١- إن الله خلق مائة رحمة فبث بين خلقه رحمة واحدة فهم يتراحمون بها و ادخر عنده لأوليائه تسعة و تسعين.

( صحيح ) ( طب ابن عساكر ) عن معاوية بن حيدة .

**٧٤٤١- خوای گەورە سەد ڕەحمەتی دروست کردووە و ،یەك ڕەحمەتی بلاو کردووەتەوە بە نێو درووست کراوەکانی ،ئەوانیش بەوەبەزەییان دێتەوە بە یەکتردا ،ئەوەدو نۆیشی هەڵگرتووە بۆ خۆشەویستانی .**

( الصحيحة ١٦٣٤ )

٧٤٤٢- إن الله تعالى خلق يوم خلق السموات و الأرض مائة رحمة كل رحمة طباق ما بين السماء و الأرض فجعل منها في الأرض رحمة فبها تعطف الوالدة على ولدها و الوحش و الطير بعضها على بعض و أخر تسعا و تسعين فإذا كان يوم القيامة أكملها بهذه الرحمة.

( صحيح ) ( حم م ) عن سلمان ( حم هـ ) عن أبي سعيد .

**٧٤٤٢- خوای گەورە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی درووست کرد سەد ڕەحمەتی دروست کردوە ،هەموو ڕەحمەتێك ئەوەندەی نێوان ئاسمان و زەوییە ،یەکێکی لە زەوی داناوە بەوە دایك سۆزی بۆ منالەکەی دەبێت و ،دڕەندەو بالندە لە ناو یەکتردا بەزەییان بە خۆیاندادێتەوە ،ئەوەدو نۆیشی دواخستووە ،جاکاتێك ڕۆژی قیامەت دێت بەم ڕەحمەتە تەواوی دەکات .**

( الصحيحة ١٦٣٤ )

٧٤٤٣- إن الله تعالى لما خلق الخلق كتب بيده على نفسه: إن رحمتي تغلب غضبي.

( صحيح ) ( ت هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٤٤٣- خوای گەورە کاتێك دروست کراوەکانی دروست کرد بە دەستی خۆت لەسەر خۆی نووسی : بەڕاستی میهرەبانیم دەکەوێتە پێش تووڕە بوونم .**

( الصحيحة ١٦٢٩ )

٧٤٤٤- إن لله مئة رحمة ، أنزل منها رحمة واحدة بين الجن و الأنس و البهائم و الهوام فيها يتعاطفون و بها يتراحمون و بها تعطف الوحوش على ولدها و أخر تسعا و تسعين رحمة يرحم بها عباده يوم القيامة.

( صحيح ) ( م هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٤٤٤- بێگومان خوای گەورە سەدڕەحمەتی هەیە ،یەکێکیانی ناردۆتە نێو جنۆکەو مرۆڤ و ئاژەڵ و زیندەوەر بەوە بەرامبەر یەك میهرەبانن و بەوە بەزەییان بە یکتردا دێتەوە هەر بەوە دڕەندەکانیش سۆزیان بۆ یەکتر هەیە ،نەوەدو نۆیشی دواخستووە بۆ ئەوەی بەزەیی و سۆزی بۆ بەندەکانی پەخش بکات لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( المشكاة ٢٣٦٥ )

٧٤٤٥- جعل الله الرحمة مائة جزء فأمسك عنده تسعة و تسعين جزءا و أنزل في الأرض جزءا واحدا فمن ذلك الجزء تتراحم الخلق حتى ترفع الفرس حافرها عن ولدها خشية أن تصيبه.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة .

**٧٤٤٥- خوای گەورە بەزەیی کردووە بە سەد بەشەوە ،نەوەدو نۆی لای خۆی داناوەو بەشێکیشی خستووەتە سەر زەوی ،بەو بەشە هەموو دروست کراوەکان بەزەییان بە یەکتردا دێتەوە ،تەنانەت ئەسپ سمی بەرز دەکاتەوە نەوەك بەچکەکەی بشێلێ .**

( الصحيحة ١٦٣٤ )

٧٤٤٦- خلق الله مائة رحمة فوضع رحمة واحدة بين خلقه يتراحمون بها و خبأ عنده مائة إلا واحدة.

( صحيح ) ( م ت ) عن أبي هريرة .

**٧٤٤٦- خوای گەورە سەد بەزەیی دروستکردووە ،یەکێکیانی لەناو دروستکراوەکانیدا داناوە و بەوە بەزەییان بەیەکتردا دەهاتەوە ،نەوەدو نۆشی شاردووەتەوە .**

( الصحيحة ١٦٣٤ )

٧٤٤٧- الرحمة عند الله مائة جزء فقسم بين الخلائق جزءا و أخر تسعا و تسعين إلى يوم القيامة.

( صحيح ) ( البزار ) عن ابن عباس.

**٧٤٤٧- سۆزو بەزەیی لەلای خوا سەد بەشە ،بەشێکی دابەش کردووە لە نێو دروستکراوەکانیدا ،نەوەدو نۆیشی دواخستووە بۆ ڕۆژی قیامەت .**

٧٤٤٨- كتب ربكم على نفسه بيده قبل أن يخلق الخلق: رحمتي سبقت غضبي.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٤٤٨- پەروەردگارتان پێش درووستکردنی دروستکراوەکان ،لەسەر خۆی نوسیوە ، میهرەبانیم پێش تووڕەیەی داتەوە .**

( الصحيحة ١٦٢٩ )

٧٤٤٩- الكبائر: الشرك بالله و الإياس من روح الله و القنوط من رحمة الله.

( صحيح ) ( البزار ) عن ابن عباس.

**٧٤٤٩- تاوانە گەورەکان : هاوبەشی دانان بۆ خواو ،نا ئومێد بوون لە بەزەیی خواو ،ڕەنجە ڕۆیی لە میهرەبانی خوا .**

( الصحيحة ٢٠٥١ )

٧٤٥٠- لقد حظرت رحمة الله واسعة إن الله تعالى خلق مائة رحمة فأنزل رحمة يتعاطف بها الخلائق جنها و إنسها و بهائمها و عنده تسعة و تسعون أتقولون: هو أضل أم بعيره ؟.

( صحيح ) ( حم د ك ) عن جندب.

**٧٤٥٠- تۆ میهرەبانیەکی فراوانت تەنگ کردەوە[1]، خوای گەورە سەد ڕەحمەتی دروست کردووە ،جا یەکێکیانی دابەزاندووەو بەوە دروستکراوەکانی بە جنۆکەو مرۆڤەکان و**

---

[1] بەو عەرەبە بیابان نیشینەی فەرموو کە وتی : خوایە ڕەحم بە من و موحەممەد بکە و لەگەڵ ئێمەدا ڕەحم بە کەسی ترمەکە .

ئاژەڵەوە بەزەییان بەیەکدا دێتەوە لە نێوان خۆیاندا ،نەوەدو نۆیشی لەلای خۆیەتی ،ئێوە دەڵێن : کامیان گومڕاترە خۆی یان وشترەکەی ؟

( صحيحة ابی داود ٨٢٥ )

٧٤٥١- لما قضى الله الخلق كتب في كتابه فهو عنده فوق العرش: إن رحمتي غلبت غضبي.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٧٤٥١- کاتێك خوای گەورە دروستکراوەکانی دروست کرد ،لە نوسراوی لای خۆی لەسەر عەرش نوسی : ڕەحمەتم کەوتووەتە پێش تووڕەییم .**

( الصحيحة ١٦٢٩ )

٧٤٥٢- لو تعلمون قدر رحمة الله لاتكلتم عليها.

( صحيح ) ( البزار ) عن أبي سعيد.

**٧٤٥٢- ئەگەر ئەندازەی ڕەحمەتی خوا بزانیایە چەندە پشتان پێدەبەست .**

( الصحيحة ٢١٦٧ )

٧٤٥٣- لو يعلم المؤمن ما عند الله من العقوبة ما طمع في الجنة أحد و لو يعلم الكافر ما عند الله من الرحمة ما قنط من الجنة أحد.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٧٤٥٣- ئەگەر باوەڕدار بیزانیبا ئەو سزایەی لەلای خوا چۆنە کەس بەتەمای بەهەشت نەدەما ،ئەگەر بێباوەڕیش بیزانیبا ئەندازەی سۆزو بەزەیی لەلای خوا چەندە ،کەس لە بەهەشتی خوا نائومێد نەدەبوو .**

( الصحيحة ١٦٣٤ )

٧٤٥٤- من رحم و لو ذبيحة عصفور رحمه الله يوم القيامة.

( صحيح ) ( خد طب الضياء ) عن أبي أمامة.

**٧٤٥٤- هەرکەس بەزەیی هەبێت با لە سەر بڕینی چۆلەکەیەکیشدا بێت ،خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بەرامبەری بەبەزەیی دەبێت .**

( الصحيحة ٢٧ )

٧٤٥٥- و الله لا يلقي الله حبيبه في النار.

( صحيح ) ( ك ) عن أنس.

**٧٤٥٥- سوێند به خوا ، خوای گەورە خۆشەویستی خۆی ناخاتە ئاگرەوە ( دۆزەخەوە ) .**

( الصحيحة ١٤٠٧ )

## بابەتی چاکەکردن

٧٤٥٦- إن الله تعالى محسن فأحسنوا.

( صحيح ) ( عد ) عن سمرة .

**٧٤٥٦- بەڕاستی خوای گەورە چاکەکارە ، دەی ئێوەش چاکە بکەن .**

( الصحيحة ٤٦٤ )

٧٤٥٧- الإحسان أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك.

( صحيح ) ( م ٣ ) عن عمر ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٤٥٧- چاکە ئەوەیە خوا بپەرستی وەکو ئەوەی بیبینی ، جا ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەو تۆ ئەبینی .**

( المشكاة ٢ )



# پەراوی خەو بینین

## بابەتی ترساندن لە خەوی درۆ

٧٤٥٨- إن من أعظم الفرى أن يدعى الرجل إلى غير أبيه أو يرى عينيه ما لم تريا و يقول على رسول الله صلى الله عليه وسلم ما لم يقل.

( صحيح ) ( خ ) عن واثلة .

**٧٤٥٨- گەورەترین درۆ ئەوەیە ، پیاوێك بانگەشەی ئەوە بكات كوڕی پیاوێكی تـرە جگـە لە باوكی خۆی ،یان بڵێت خەونێكی بینیوەو نەشیبینیوە ،یان بـەدەم پێغەمبـەرەوە ﷺ قسە هەڵبەسێت .**

٧٤٥٩- إن من أفرى الفرى أن يرى الرجل عينه في المنام ما لم تر.

( صحيح ) ( حم ) عن ابن عمر .

**٧٤٥٩- گـەورەترین درۆ و فیـت لێـدان ئەوەیـە بـە درۆوە بڵـێ فلانەخـەوم بینیـوە نەشـی بینیبێت .**

( الصحيحة ٣٠٦٣ )

٧٤٦٠- من استمع إلى حديث قوم و هم له كارهون صب في أذنيـه الآنـك و مـن أرى عينيـه في المنام ما لم ير كلف أن يعقد شعيرة.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٧٤٦٠- هەركەس گوێ لە قسەی كەسانێك بگرێت و ئەوان پێیان نـاخۆش بێـت قوڕقوشـم دەكرێتـە گوێی ،هەركەسیش بە درۆ بڵێ فلاَنە خەوم بینیوە داوای لێ دەكرێت موویەك گرێ بدات .**

( غاية المرام ٤١٧ )

٧٤٦١- من تحلم كاذبا كلف يوم القيامة أن يعقد بين شعيرتين و لن يعقد بينهما.

( صحيح ) ( ت هـ ) عن ابن عباس.

**٧٤٦١- هەركەس بەدرۆ خەوێك بگێڕێتەوە ،لە ڕۆژی قیامەت داوای لێدەكرێت دوو دەنكە جۆ گرێ بدات و هەرگیز ئەو كارەشی پێناكرێت .**

(صحيح الترمذي ٢٢٨٣ )

٧٤٦٢- من كذب في حلمه كلف يوم القيامة عقد شعيرة.

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن علي.

**٧٤٦٢- هەركەس لە خەونەكەیدا درۆ بكات ،لە ڕۆژی قیامەتدا داوای لێدەكرێت گرێ لە دەنكە جۆیەك بدات .**

( الصحيحة ٢٣٥٩ )

## بابەتی خەونی چاك لە مژدەكانە

٧٤٦٣- إذا اقترب الزمان لم تكد رؤيا الرجل المسلم تكذب و أصدقهم رؤيا أصدقهم حديثا.

( صحيح ) ( ق هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٤٦٣- كاتێك زەمانە نزیك دەبێتەوە ،خەونی موسڵمان كەم جار درۆ دەردەچێت ،كامەشیان خەونەكەی ڕاستربێت ،قسەكانی ڕاسترە .**

(صحيح الترمذي ٢٢٧٠ )

٧٤٦٤- إن الرسالة و النبوة قد انقطعت فلا رسول بعدي و لا نبي و لكن المبشرات رؤيا الرجل المسلم و هي جزء من أجزاء النبوة.

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن أنس .

**٧٤٦٤- بەڕاستی پەیامی ئاسمان و پێغەمبەرایەتی بڕاوەتەوە و ،لە پاش من پێغەمبەر نایەت بەڵام مژدەكان دەمێنن: خەونی پیاوی موسڵمان ،بەشێكە لە چەند بەشێكی پێغەمبەرایەتی .**

( الارواء ٢٤٧٣ )

٧٤٦٥- ذهبت النبوة فلا نبوة بعدي إلا المبشرات: الرؤيا الصالحة يراها الرجل أو ترى له.

( صحيح ) ( طب ) عن حذيفة بن أسيد.

**٧٤٦٥- پێغەمبەرایەتی ڕۆیشت ، چونکە لە پاش من پێغەمبەرایەتی نەما ، تەنها مژدەدەرەکان نەبێت : خەونێکی ڕاست کە پیاو بیبینێت ، یان پێوەی ببینرێت .**

( الارواء ٢٤٧٣ )

٧٤٦٦- ذهبت النبوة و بقيت المبشرات.

( صحيح ) ( هـ ) عن أم كرز.

**٧٤٦٦- پێغەمبەرایەتی ڕۆیشت و ، تەنها مزگێنەکان ماونەتەوە .**

( الارواء ٢٤٧٣ )

٧٤٦٧- رؤيا المسلم الصالح جزء من سبعين جزءا من النبوة.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي سعيد.

**٧٤٦٧- خەونی موسڵمانی پیاو چاك ، بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی .**

( الروض النضير ٦١٦ )

٧٤٦٨- رؤيا المؤمن جزء من أربعين جزءا من النبوة و هي على رجل طائر ما لم يحدث بها فإذا تحدث بها سقطت و لا تحدث بها إلا لبيبا أو حبيبا.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي رزين.

**٧٤٦٨- خەونی بڕوادار بەشێکە لە چل بەشی پێغەمبەرایەتی ، نایەتەدیش تا کو خاوەنەکەی باسی نەکات ، ئەگەر باسی بکات دێتە دی ، باسیشی مەکە بۆ هۆشمەند ، یان خۆشەویست نەبێت .**

( الصحيحة ١٢٠ )

٧٤٦٩- رؤيا المؤمن جزء من ستة و أربعين جزءا من النبوة.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أنس ( حم ق د ت ) عن عبادة بن الصامت ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٤٦٩- خەونی موسڵمان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی .**

٧٤٧٠- رؤيا المؤمن جزء من ستة و أربعين جزءا من النبوة و هي على رجل طائر ما لم يحدث بها و إذا حدث بها وقعت.

( صحيح ) ( ت ك ) عن أبي رزين.

**٧٤٧٠- خەونی موسڵمان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی ، ئەگەر پیاو باسی نەکات نایەتەدی ، بەڵام ئەگەر باسی بکات دێتەدی .**

( الصحيحة ١٢٠ )

٧٤٧١- بشرى الدنيا الرؤيا الصالحة.

( صحيح ) ( طب ) عن أبي الدرداء .

**٧٤٧١- مژدەى دونيايى خەونى خۆشە .**

( الصحيحة ١٧٨٦ )

٧٤٧٢- الرؤيا الحسنة من الرجل الصالح جزء من ستة و أربعين جزءا من النبوة.

( صحيح ) ( حم خ ن هـ ) عن أنس.

**٧٤٧٢- خەونى چاك لە پياوى چاكەوە بەشێكە لە چل و شەش بەشى پێغەمبەرايەتى .**

( صحصي ابن ماجة ٣٨٩٣ )

٧٤٧٣- الرؤيا الحسنة هي البشرى يراها المؤمن أو ترى له.

( صحيح ) ( ابن جرير ) عن أبي هريرة.

**٧٤٧٣- خەونى چاك مژدەيە بڕوادار دەيبينێ ،يان پێوەى دەبينرێ .**

( الصحيحة ١٧٨٦ )

٧٤٧٤- الرؤيا الصالحة جزء من خمسة و عشرين جزءا من النبوة.

( صحيح ) ( ابن النجار ) عن ابن عمر.

**٧٤٧٤- خەونى چاك بەشێكە لە بيست و پێنج بەشى پێغەمبەرايەتى .**

( الصحيحة ١٨٦٩ )

٧٤٧٥- الرؤيا الصالحة جزء من سبعين جزءا من النبوة.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن ابن عمر ( حم ) عن ابن عباس.

**٧٤٧٥- خەونى چاك بەشێكە لە حەفتا بەشى پێغەمبەرايەتى .**

( الصحيحة ٦١٦ )

٧٤٧٦- الرؤيا الصالحة جزء من ستة و أربعين جزءا من النبوة.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي سعيد ( م ) عن ابن عمرو وأبي هريرة ( حم هـ ) عن أبي رزين (طب) عن ابن مسعود.

**٧٤٧٦- خەونى چاك بەشێكە لە چل و شەش بەشى پێغەمبەرايەتى .**

( المشكاة ٤٦٠٨ )

٧٤٧٧- الرؤيا الصالحة من الله و الحلم من الشيطان فإذا رأى أحدكم شيئا يكرهه فلينفث حين يستيقظ عن يساره ثلاثا و ليتعوذ بالله من شرها فإنها لا تضر.

( صحيح ) ( ق د ت ) عن أبي قتادة.

**٧٤٧٧- خەونی چاك لە خواوەیە خەونی تریش لە شەیتانەوەیە ، جا هەر یەكێكتان شتێكی ناخۆشی لە خەودا بینی با كە خەبەری بووەوە سێ جار تف بەلای چەپدا بكات و پەنا بە خوا بگرێت بە شەڕی ـ ئیتر بێگومان زیانی پێ ناگەیەنێت .**

( الترغيب ١٥٩٩ )

٧٤٧٨- الرؤيا الصالحة من الله و الرؤيا السوء من الشيطان فمن رأى رؤيا فكره منها شيئا فلينفث عن يساره و ليتعوذ بالله من الشيطان فإنها لا تضره و لا يخبر بها أحدا فإن رأى رؤيا حسنة فليبشر و لا يخبر بها إلا من يحب.

( صحيح ) ( م ) عن أبي قتادة.

**٧٤٧٨- خەونی چاك لەلایەن خواوەیە ،خەونی تریش هەیە لەلای شەیتانەوەیە ،جا ئەگەر كەسێكتان خەونێكی ناخۆشی بینی سێ جار بەلای چەپدا تف بكات و ، پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتان ئیتر زیانی پێناگەیەنێت ،بۆ كەسیشی نەگێڕێتەوە ،بەلام ئەگەر خەونێكی خۆشی بینی بابیكاتە مژدە و بۆ خۆشەویستی خۆی نەبێت باسی نەكات .**

٧٤٧٩- الرؤيا ثلاثة فبشرى من الله و حديث النفس و تخويف من الشيطان فإذا رأى أحدكم رؤيا تعجبه فليقصها إن شاء على أحد و إن رأى شيئا يكرهه فلا يقصه على أحد و ليقم يصلي و أكره الغل و أحب القيد القيد ثبات في الدين.

( صحيح ) ( ت هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٤٧٩- خەون سێ جۆرە : یان مژدەیەكە لەلای خواوە یان ،دالغەو قسەی دەروونە یان ، ترساندنە لە لایەن شەیتانەوە ،جا ئەگەر كەسێكتان خەونێكی بینی پێی خۆش بوو ئەگەر ویستی با باسی بكات ئەگەر نا باسی نەكات ،ئەگەر خەونێكیشی بینی پێی ناخۆش بوو با باسی نەكات و ،هەلسێت نوێژ بكات و ،كۆتیشم پێناخۆشە و[1]،بەلام پێوەندم پێ باشە [2]، پێوەند سەقامگیر بوونە لەسەر ئایین .**

( الصحيحة ١٣٤١ )

---

[1] لە خەوندا ،چونكە سزایەو ئەشكە نجەیەو بەزاندن و سەرشۆڕكردنە .

[2] چونكە ئەگەر لە قاچیدا بێت وازهێنانە لە خراپەو تاوان

٧٤٨٠- الرؤيا ثلاثة: منها تهاويل من الشيطان ليحزن ابن آدم و منها ما يهم به الرجل في يقظته فيراه في منامه و منها جزء من ستة و أربعين جزءا من النبوة.

( صحيح ) ( هـ ) عن عوف بن مالك.

**٧٤٨٠- خەون سێ جۆرە : هەندێك ترس و بیمە لە شەیتانەوە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد غەمبار بكات ،هەندێكیشی شتێكە كە كەسێك دەیەوێت كەبەخەبەرە ئەنجامی بدات ، بەڵام لە خەوندا دەیبینێ ،هەندێكیشی بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی .**

( الصحيحة ١٨٧٠ )

٧٤٨١- كان يعجبه الرؤيا الحسنة.

( صحيح ) ( حم ن ) عن أنس.

**٧٤٨١- پێغەمبەر ﷺ خەونی خۆشی پێخۆش بوو .**

( الصحيحة ٢١٣٥ )

## بابەتی لێكدانەوەی خەون

٧٤٨٢- لم يبق من النبوة إلا المبشرات الرؤيا الصالحة.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة.

**٧٤٨٢- هیچ شتێك لە پێغەمبەرایەتی نەماوە جگە لە خەونی باش نەبێت .**

( الصحيحة ٤٧٤ )

٧٤٨٣- إذا حلم أحدكم فلا يحدث الناس بتلعب الشيطان في المنام.

( صحيح ) ( م هـ ) عن جابر .

**٧٤٨٣- ئەگەر كەسێكتان خەونێكی بینی باباسی گاڵتەو گەمەی[1] شەیتان نەكات لە خەوندا .**

( صحيحة ابن ماجة ٣٩١٣ )

٧٤٨٤- إذا رأى أحدكم الرؤيا الحسنة فليفسرها و ليخبر بها و إذا رأى الرؤيا القبيحة فلا يفسرها و لا يخبر بها.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة .

---

**[1] یاری چاك و خراپ و ڕاست و درووست و هەڵەی هەیە . بەڵام گاڵتەو گەمە هەمووی بێ هوودەو بێ سوود و منداڵ بازاڕە .**

**٧٤٨٤- ئەگەر يەكێكتان خەونى خۆشى بينى با ليكى بداتەوەو باسى بكات بەلاّم ، ئەگەر خەونى ناخۆشى بينى باليكى نەداتەوەو باسيشى نەكات .**

٧٤٨٥- إذا رأى أحدكم الرؤيا يحبها فإنما هي من الله فليحمد الله عليها و ليحدث بها و إذا رأى غير ذلك مما يكره فإنما هي من الشيطان فليستعذ بالله و لا يذكرها لأحد فإنها لا تضره.

( صحيح ) ( حم خ ت ) عن أبي سعيد .

**٧٤٨٥- ئەگەر يەكێكتان خەونێكى خۆشى بينى و پێى خۆش بوو ئەوە لە خواوەيە ،با سوپاسى خوا بكات و باسيشى بكات ،ئەگەر شتێكى ترى بينى و پێى ناخۆش بوو ،ئەوە لە شەيتانەوەيە ،با پەنا بە خوا بگرێت و ،باسى نەكات بۆ كەس ، ئيتر زيانى پێناگەيەنێت .**

( الترغيب ١٥٩٨ )

٧٤٨٦- إذا رأى أحدكم الرؤيا يحبها فإنما هي من الله فليحمد الله عليها و ليحدث بها و إذا رأى غير ذلك مما يكره فإنما هي من الشيطان فليستعذ بالله من شرها و لا يذكرها لأحد فإنها لا تضره.

( صحيح ) ( حم خ هـ ) عن أبي سعيد .

**٧٤٨٦- ئەگەر يەكێكتان خەونێكى بينى پێى خۆش بوو ، بێگومان ئەوە لەلاى خواوەيە ، با سوپاسى خوا بكات و ،باسى بكات ،ئەگەر شتێكى ترى بينى ئەوە لەلايەن شەيتانەوەيە ،با پەنا بە خوا بگرێت لە خراپەى ئەو خەونەو ،باسى نەكات بۆ كەس ، ئيتر زيانى پێناگەيەنێت .**

( الترغيب ١٥٩٨ )

٧٤٨٧- إذا رأى أحدكم الرؤيا يكرهها فليبصق عن يساره ثلاثا و ليستعذ بالله من الشيطان ثلاثا و ليتحول عن جنبه الذي كان عليه

( صحيح ) ( م د هـ ) عن جابر .

**٧٤٨٧- ئەگەر يەكێكتان خەونێكى ناخۆشى بينى با سێ جار بەلاى چەپى خۆى تف بكات و ، سێ جار پەنا بە خوا بگرێت لە شەيتان و خۆى وەرگێڕێتە سەر لايەكى تر .**

( الصحيحة ١٣١١ )

٧٤٨٨- إذا رأى أحدكم رؤيا يكرهها فليتحول و ليتفل عن يساره ثلاثا و ليسأل الله من خيرها و ليتعوذ بالله من شرها

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٤٨٨- ئەگەر یەكێكتان خەونێكی ناخۆشی بینی با خۆی وەرگێڕێتە سەر لایەكی ترو ، سیّ جار بەلای چەپدا تف بكات و ،داوای چاكەكەی لە خوای گەورە بكات و ، پەنا بە خوا بگرێت لە خراپەكانی .**

( الصحيحة ١٣١١ )

٧٤٨٩- إذا لعب الشيطان بأحدكم في منامه فلا يحدث به الناس.

( صحيح ) ( م هـ ) عن جابر .

**٧٤٨٩- ئەگەر شەیتان یاری بە كەسێكاتان كرد لە خەونیدا ،باباسی نەكات بۆ كەس .**

( الصحيحة ٣٩٦٨ )

٧٤٩٠- إن الرؤيا تقع على ما تعبر و مثل ذلك مثل رجل رفع رجليه فهو ينتظر متى يضعها فإذا رأى أحدكم رؤيا فلا يحدث بها إلا ناصحا أو عالما.

( صحيح ) ( ك ) عن أنس .

**٧٤٩٠- خەون بەو شێوەیە دەبێت كە لێك دەدرێتەوە ، نموونەی ئەوەیش نموونەی پیاوێكە هەردوو قاچی بەرز كردبێتەوە ، چاوەڕوانە كەی دایانگرێتەوە ،بۆیە ئەگەر یەكێكتان خەونێكی بینی با ،بۆ كەسێكی دڵسۆز یان زانا نەبێت باسی نەكات .**

( الصحيحة ١٢٠ )

٧٤٩١- الرؤيا على رجل طائر ما لم تعبر فإذا عبرت وقعت ولاتقصها إلا على واد أو ذي رأى.

( صحيح ) ( د هـ ) عن أبي رزين.

**٧٤٩١- خەون هەڵواسراوە تاكو لێك دەدرێتەوە جا كە لێكدرایەوە دێتەدی ،باسیشی مەكە بۆ كەسێكی خۆشەویست یان خاوەن پرس و ڕا نەبێت .**

( الصحيحة ١٢٠ )

٧٤٩٢- الرؤيا من الله و الحلم من الشيطان فإذا رأى أحدكم شيئا يكرهه فليبصق عن يساره ثلاثا و ليستعذ بالله من الشيطان الرجيم ثلاثا و ليتحول عن جنبه الذي كان عليه.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي قتادة.

**٧٤٩٢- خەوی باش لەلایەن خواوەیە و خەوی خراپیش لەلایەن شەیتانەوەیە ،جا ئەگەر كەسێكتان خەونێكی نا خۆشی بینی با سیّ جار بەلای چەپدا تف بكات و سیّ جار پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتانی نەفرەت لێكراو ،با بچێتە سەر لایەكی تری .**

( المشكاة ٤٦١٣ )

٧٤٩٣- اللبن في المنام فطرة.

( صحيح ) ( البزار ) عن أبي هريرة.

**٧٤٩٣- شیر لە خەودا ( فیترەتە ) سروشتە .**

( الصحيحة ٢٢٠٧ )

٧٤٩٤- لا تقص الرؤيا إلا على عالم أو ناصح.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٧٤٩٤- خەون باس مەكە بۆ كەسێكی زانا یان دڵسۆز[1] نەبێت .**

( الصحيحة ١١٩ )

٧٤٩٥- يعمد الشيطان إلى أحدكم فيتهول له ثم يغدو يخبر الناس ؟ !.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٤٩٥- شەیتان بەئەنقەست دێتە خەوی كەسێكتان و دەی ترسێنێ ،ئەویش ئەچێ لەلای خەڵكی باسی دەكات ؟!**

( الصحيحة ٢٥٣ )

## بابەتی بینینی پێغەمبەر ﷺ لە خەوندا

٧٤٩٦- من رآني فإني أنا هو فإنه ليس للشيطان أن يتمثل بي.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٧٤٩٦- هەركەس لە خەوندا منی بینی ئەوە ڕێك منی بینیوە ، چونكە شەیتان بۆی نی یە خۆی وەكو من لێ بكات.**

( الروض ٩٩٥ )

٧٤٩٧- من رآني فقد رأى الحق فإن الشيطان لا يتزايا بي.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي قتادة.

**٧٤٩٧- هەركەس من ببینێ بەڕاستی ئەوە هەق و ڕاستی بینیوە ، چونكە شەیتان ناتوانێت خۆی وەكو من لێ بكات .**

( المشكاة ٤٦١٠ )

٧٤٩٨- من رآني فقد رأى الحق فإن الشيطان لا يتزايا بي.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي سعيد.

**٧٤٩٨- هەرکەس بینیمی بەڕاستی ئەوە هەقی بینیوە ، چونکە شەیتان خۆی پێناکرێتە من .**

( الروض ٩٩٥ )

٧٤٩٩- من رآني في المنام فسيراني في اليقظة و لا يتمثل الشيطان بي.

( صحيح ) ( ق د ) عن أبي هريرة.

**٧٤٩٩- هەرکەس لە خەوندا منی بینی ، ئەوە وەك بەخەبەر هاتووی منی ببینێ وایە ، شەیتان ناتوانێت خۆی وەکو منی لێ بکات .**

( الروض ٩٩٥ )

٧٥٠٠- من رآني في المنام فقد رآني إنه لا ينبغي للشيطان أن يتمثل في صورتي.

( صحيح ) ( حم م هـ ) عن جابر.

**٧٥٠٠- هەرکەس لە خەوندا بینیمی ئەوە بەڕاستی منی بینیوە ، چونکە شەیتان بۆی نیە خۆی بخاتە سەر شێوەی من .**

( الروض ٩٩٥ )

٧٥٠١- من رآني في المنام فقد رآني فإن الشيطان لا يتمثل بي.

( صحيح ) ( حم خ ت ) عن أنس.

**٧٥٠١ -هەرکەس لە خەوندا منی بینی ئەوە بەڕاستی منی بینیوە ، چونکە شەیتان ناتوانێت خۆی وەکو من لێ بکات.**

( الروض ٩٩٥ )

## بابەتی خەونەکانی پێغەمبەر ﷺ

٧٥٠٢- إني رأيت في المنام كأن جبريل عند رأسي و ميكائيل عند رجلي يقول أحدهما لصاحبه: اضرب له مثلا فقال: اسمع سمعت أذنك و اعقل عقل قلبك إنما مثلك و مثل أمتك كمثل ملك اتخذ دارا ثم بنى فيها بيتا ثم جعل فيها مائدة ثم بعث رسولا يدعو الناس إلى طعامه فمنهم من أجاب الرسول و منهم من تركه فالله هو الملك و الدار الإسلام و البيت الجنة و أنت يا محمد رسول من أجابك دخل الإسلام و من دخل الإسلام دخل الجنة و من دخل الجنة أكل ما فيها

( صحيح ) ( خ ت ) عن جابر .

**٧٥٠٢- له خەونمدا بینیم جبریل لەلای سەرم و میکائیل له لای قاچمەوە بوو ،یەکێکیان دەی گوت بە هاورێکەی ووت : نموونەیەکی بۆ بهێنەرەوە ئەویش وتی : گوێگرە گوێگربیت ،حاڵی بەو بەدڵ ئاگاداربە ، نموونەی تۆو ئوممەتەکەت وەکو پادشایەکە ماڵێکی هەبێت ،ئینجا خانوویەکی لە ناو ئەو خانووە دروستکردبێت و ،سفرەیەکی تیا ڕاخستبێت ،ئینجا نوێنەرێکی ناردبێت خەڵك بانگ بکات بۆ سەر خواردنەکەی ،جا هەندێکیان بە دەم بانگێشتەکەیەوە دێن و ،هەندێکیان نایەن ،خوای گەورە ئەو پادشایەیەو ،خانوەکەیشی ئیسلامەو ،ماڵەکەی ناویشی بەهەشتەو ،تۆیش ئەی موحەممەد ڕەوانەکراوەکەی ،هەرکەس گوێڕایەڵت بێت دەچێتە ئیسلامەوە هەر کەسیش چووە ئیسلامەوە دەچێتە بەهەشتەوە ،هەرکەسیش بچێتە بەهەشتەوە له خواردنەکانی دەخوا .**

( الصحيحة ٣٥٩٥ )

٧٥٠٣- أراني الليلة عند الكعبة فرأيت رجلا آدم كأحسن ما أنت راء من أدم الرجال له لمة كأحسن ما أنت راء من اللمم قد رجلها فهي تقطر ماء متكئا على رجلين يطوف بالبيت فسألت من هذا ؟ فقيل لي: المسيح ابن مريم ثم إذا أنا برجل جعد قطط أعور العين اليمنى كأنها عنبة طافية فسألت من هذا ؟ فقيل لي: المسيح الدجال.

( صحيح ) ( مالك حم ق ) عن ابن عمرو .

**٧٥٠٣- له خەونمدا بینیم له لای کەعبەم و پیاوێکی گەنم ڕەنگی جوانم بینی ،قژێکی جوانی بەسەر شاندا شۆڕ بووبووەوە ،شانەی کردبوو ئاوی لێ دەتکا ،خۆی دابووە سەر دوو کەسدا و تەوافی دەکرد ، پرسیارم کرد ئەوە کێ یە ؟ وتیان عیسای کوڕی مەریەمە ،ئینجا پیاوێکی قژ بژم بینی ،چاوی ڕاستی کوێر بوو ،دەتوت بۆ له ترێ بڵە ، پرسیارم کرد ئەوە کێ یە ؟ وتیان ئەوە مەسیحی دەجاله .**

( الصحيحة ٣٩٨٣ )

٧٥٠٤- أراني في المنام أتسوك بسواك فجاءني رجلان أحدهما أكبر من الآخر فناولت السواك الأصغر منهما فقيل لي: كبر فدفعته إلى الأكبر منهما.

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمر .

**٧٥٠٤- له خەونمدا بینیم بە دار سیواکێك سیواکم دەکرد لەو کاتەدا دوو پیاو هاتن لام یەکێکیان لەوی تریان گەورەتر بوو ،سیواکەکەم دایە دەستی بچوکەکەیان ، پێم وترا : بیدەرە دەستی گەورە کەیان ،منیش دامە دەستی گەورەکەیان .**

( الصحيحة ١٥٥٥ )

٧٥٠٥- ألا إن المسيح الدجال أعور العين اليمنى كأن عينه عنبة طافية و أراني الليلة عند الكعبة في المنام فإذا رجل آدم كأحسن ما ترى من أدم الرجال تضرب لمته بين منكبيه رجل الشعر يقطر رأسه ماء واضعا يديه على منكبي رجلين و هو بينهما يطوف بالبيت " فقلت: من هذا ؟ فقالوا: المسيح بن مريم ثم رأيت رجلا وراءه جعدا قططا أعور العين اليمنى كأشبه من رأيت بابن قطن واضعا يديه على منكبي رجل يطوف بالبيت فقلت: من هذا ؟ فقالوا: المسيح الدجال.

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمرو .

**٧٥٠٥- ئاگادار بن دەججال چاوی ڕاستی کوێرە ، چاوی دەڵێی بۆڵە تریی بلقنە ، ئەمشەویش لە خەنمدا بینیم لە لای کەعبە بووم ، پیاوێکی گەنم ڕەنگم بینی لە جوانترینی ئەو پیاوانەی بەچاو ببینرێت قژی بە شانە کراوی بە نێو شانیدا هاتبوونە خوارەوە ،ئاویان لێ دەتکا ،هەردوو دەستی خستبووە سەر شانی دوو پیاو و،لە نێوانیاندا تەوافی دەکرد ، وتم : ئەوە کێ یە ؟ وتیان مەسیحی کوڕی مەریەمە ،لە دوای ئەویش پیاوێکی قژ بژو ئاڵۆزکاوم بینی ،چاوی ڕاستی کوێر بوو ،زۆر لە ( ابن قطن )ی دەکرد ،هەردوو دەستی خستبووە سەر شانی کەسێك تەوافی دەکرد ،وتم ئەوە کێ یە ؟ وتیان : مەسیحی دەججال .**

( المشكاة ٥٤٨٣ )

٧٥٠٦- بينا أنا نائم أتيت بخزائن الأرض فوضع في يدي سواران من ذهب فكبرا علي و أهماني فأوحى الله إلي: أن انفخهما فنفختهما فذهبا فأولتهما الكذابين اللذين أنا بينهما: صاحب صنعاء و صاحب اليمامة

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٧٥٠٦- لە خەونمدا گەنجینەکانی سەر زەویم بۆ هێنراو دوو بازنی ئاڵتوون کرایە دەستم ،لەسەر شانم گران بوو هەر ئەوە بوو مایەی پەژارەم و ئیتر خوا (وەحی) نیگای بۆ کردم کە ،فوویان پیا بکە ئیتر منیش فووم پیاکردن و یەکسەر نەمان ،منیش خەونەکەم لێکدایەوە بەو دوو درۆزنەی من لە نێوانیاندام لە کابرای صەنعانی[1] و ،یەمامەی[2] .**

( الصحيحة ٣٦١١ )

---

[1] **ئەسوەدی عەنسی .**

[2] **موسەیلەمەی درۆزن .**

٧٥٠٧- بينا أنا نائم رأيت في يدي سوارين من ذهب فأهمني شأنهما فأوحي إلي في المنام: أن انفخهما فنفختهما فطارا فأولتهما كذابين يخرجان من بعدي فكان أحدهما العنسي و الآخر مسيلمة.

( صحيح ) ( ق ن هـ ) عن أبي هريرة ( خ ) عن ابن عباس .

**٧٥٠٧- وابوو خەوتبوم و لە خەونمدا بینیم دوو بازنەی ئاڵتوونم لە دەستدایە و ، رووداوی ئەوانە خەمباریان کردم ،ئیتر خوای گەورە هەر لە خەونمدا وەحی بۆ کردم : کە فوویان پیابکە ، منیش فووم پیاکردن و بەرباد بوون ،ئیتر بەو دوو درۆزنە لێکم دایەوە کە لە دوای من پەیدا دەبن یەکێکیان عەنسی یەو ،ئەوی تریان موسەیلەمەیە .**

( المشكاة ٤٦١٩ )

٧٥٠٨- بينما أنا نائم رأيتني أطوف بالكعبة فإذا رجل آدم سبط الشعر بين رجلين ينطف رأسه ماء فقلت: من هذا ؟ قالوا: هذا ابن مريم ثم ذهبت ألتفت فإذا رجل أحمر جسيم جعد الرأس أعور العين كأن عينه عنبة طافية قلت: من هذا ؟ قالوا: الدجال أقرب الناس به شبها ابن قطن.

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمر .

**٧٥٠٨- من خەوتبووم لە خەونمدا بینیم تەوافی دەوری کەعبە دەکەم، لەو کاتەدا پیاوێکی گەنم ڕەنگی قژ خاوم بینی لە نێوان دوو پیاودا بوو ئاو لە سەری دەتکا ،وتم : ئەوە کێ یە : وتیان : کوڕی مەریەمە ،ئینجا تەماشای ئەولام کرد ، پیاوێکی سووری کەتەی قژ بژی ،چاو تاکم بینی چاوی دەتووت ترێی[1] ،وتم : ئەوە کێ یە ؟ وتیان : ئەوە دەججالە ،زۆر لە** ( ابن قطن ) **دەچوو .**

( الصحيحة ١٨٥٧ )

٧٥٠٩- رأيت الليلة رجلين أتياني فأخذا بيدي فأخرجاني إلى الأرض المقدسة فإذا رجل جالس و رجل قائم على رأسه بيده كلوب من حديد فيدخله في شدقه فيشقه حتى يخرجه من قفاه ثم يخرجه فيدخله في شدقه الآخر و يلتئم هذا الشدق فهو يفعل ذلك به فقلت: ما هذا ؟ قالا: انطلق " فانطلقت معهما فإذا رجل مستلق على قفاه و رجل قائم بيده فهر أو صخرة فيشدخ بها رأسه فيتدهده الحجر فإذا ذهب ليأخذه عاد رأسه كما كان فيصنع مثل ذلك فقلت: ما هذا ؟ قالا: انطلق " فانطلقت معهما فإذا بيت مبني على بناء التنور أعلاه ضيق و أسفله واسع يوقد تحته نار فيه رجال و نساء عراة فإذا أوقدت ارتفعوا حتى يكادوا أن يخرجوا فإذا أخمدت

---

**[1] بۆڵە ترێی بلقن ، ئەو بۆڵە ترێیە کە سەرما یان گەرما دەییات و دەشلەقێ و ڕەنگی ناشرینی دەبێت .**

رجعوا فيها فقلت: ما هذا ؟ قالا: انطلق " فانطلقت فإذا نهر من دم فيه رجل و على شاطئ النهر رجل بين يديه حجارة فيقبل الرجل الذي في النهر فإذا دنا ليخرج رمى في فيه حجرا فرجع إلى مكانه فهو يفعل ذلك به فقلت: ما هذا ؟ قالا: انطلق " فانطلقت فإذا روضة خضراء و إذا فيها شجرة عظيمة و إذا شيخ في أصلها حوله صبيان و إذا رجل قريب منه بين يديه نار فهو يحشها و يوقدها فصعدا بي في شجرة فأدخلاني دارا لم أر دارا قط أحسن منها فإذا فيها رجال شيوخ و شباب و فيها نساء و صبيان فأخرجاني منها فصعدا بي في الشجرة فأدخلاني دارا هي أحسن و أفضل فيها شيوخ و شباب فقلت لهما: إنكما قد طوفتماني منذ الليلة فأخبراني عما رأيت قالا: نعم " أما الرجل الأول الذي رأيت فإنه رجل كذاب يكذب الكذبة فتحمل عنه في الآفاق فهو يصنع به ما رأيت إلى يوم القيامة ثم يصنع الله تعالى به ما شاء " و أما الرجل الذي رأيت مستلقيا على قفاه فرجل آتاه الله القرآن فنام عنه بالليل و لم يعمل بما فيه بالنهار فهو يفعل به ما رأيت إلى يوم القيامة " و أما الذي رأيت في التنور فهم الزناة " و أما الذي رأيت في النهر فذاك آكل الربا " و أما الشيخ الذي رأيت في أصل الشجرة فذاك إبراهيم عليه السلام " و أما الصبيان الذين رأيت فأولاد الناس " و أما الرجل الذي رأيت يوقد النار فذلك خازن النار و تلك النار " و أما الدار التي دخلت أولا فدار عامة المؤمنين " و أما الدار الأخرى فدار الشهداء " و أنا جبريل و هذا ميكائيل " ثم قالا لي: ارفع رأسك فرفعت فإذا كهيئة السحاب فقالا لي: و تلك دارك فقلت لهما: دعاني أدخل داري فقالا: إنه قد بقي لك عمر لم تستكمله فلو استكملته دخلت دارك.

( صحيح ) ( حم ق ) عن سمرة.

**٧٥٠٩- ئەمشەو لە خەونمدا دوو پیاوم بینی هاتنە لام و ،دەستیان گرتم و بردیانم بۆ خاکی پیرۆز ،لەوێ پیاوێکم بینی دانیشتووەو پیاوێکی تر بەسەریەوە وە ڕاوەستاوە ، ئاسنێکی چەماوەی بە دەستەوەبوو ،دەیکرد بە دەمی ئەو پیاوەدا و ،دەڵیدە دڕی و لە پشتی ملیەوە دەهاتە دەر ،ئینجا دەری دەهێنایەوەو ،دەی کردەوە بە دەمیدا و ، برینەکەی چاك دەبوویەوە و ،ئەویش هەر هەمان کاری دوو بارە دەکردەوە ، وتم : ئەوە چی یە ؟ وتیان بە ڕێکەوە ،منیش لەگەڵیان بە ڕێکەوتم ، پیاوێکم بینی لەسەر پشتی کەوتووە ، پیاوێکیش بە سەریەوە ڕاوەستاوە، مشتەك بەردێك ،یان لە تاوێرێکی بەدەستەوە بوو ،دەیکێشا بە سەریداو گلۆردەبووەوە ،کە دەچوو بیهێنێتەوە سەری کرا وەکو خۆی لێ دەهاتەوە ،دیسان وای لەگەڵ دەکردەوە ،وتم : ئەوە چی یە ؟ وتیان بەڕێکەوە منیش**

بەرێکەوتم ،ماڵێکم بینی لەسەر تەنوورێك درووست کراوە ، سەرەوەی تەنگ و ،خوارەوەی فـراوان بوو ،لە ژێریدا ئاگر کرابوەوە پیاو و ئافرەتی ڕووتی تیا بوو، کە ئاگرەکە گڕی دەسەندو بـەرز دە بوونەوە خەریك بوو بێنە دەرەوە ،کە کپ دەبووەوە دەکەوتنەوە ناوی ،وتم : ئەوە چی یـە ؟ وتیـان بە ڕێکەوە ،منیش بەرێکەوتم و، ڕووبارێکم بینی لە خـوێن پیـاوێکی تیـا بـوو ،لـە قەراغیشەوە پیاوێك وەستا بوو بەردێکی بە دەستەوە بوو ، پیـاوی نـاو ڕووبارەکـە لـە کـەنار ڕووبارەکـە نزیـك دەبووەوە دەیویست بێتە دەر ، پیاوەکەی تر بەردێکی بە دەمی دەکێشاو کـابراش ،دەگەڕایـەوە ،بـۆ جێگاکەی خۆی ( بۆ ناو ڕوبارەکە ) ،ئیتر ئەویش هەر وای لێ دەکرد ،وتم :ئەوە چـی یـە ؟ وتیـان بەرێکەوە ،منیش بەرێکەوتم و ،باخچەیەکی سەوزم بینی و درەختێکی گەورەی تیا بوو، پیـاوێکی پیریش لە بن درەختەکەدا بوو کۆمەڵێ منالی لە دەور بوو ، پیاوێکیش لە نزیکیەوە بوو ئـاگری لـە بەردەسـتدا بـوو ،گـڕی دەداو خۆشـی دەکـرد ،بـەرزیان کردمـەوە بـە درەختەکـەداو ،بردمیانـە خانوویەکەوە ، خانووی وا خۆشم نەبینی بوو ،هەندێ پیاوی پیرو لاو و ژن و منالی تیـا بـوو ،لـەو درەختە دایانگرتم و بە درەختێکی تردا هەڵیانگێڕام ،بردمیانـە خانوویـەکی چـاکتر و خۆشـترەوە پیرو لاوی تیابوو ، پێم وتن : ئێوە ئەمشەو منتان زۆر گەڕاند ،جا هەواڵی شتانەم بدەنێ من بینیم ،وتیان : بەڵێ :، ئەو پیاوەی یەکەم کە بینیت ئەوە پیاوێکی درۆزنە ،درۆیەك دەکـات لـە دەمیـی ئەوەوە بەهەموو لایەکدا بلاو دەبێتەوە ،بۆیە ئاوهای لـێ دەکرێـت ،تـاکو ڕۆژی قیامـەت ،دوایـش خوای گەورە چی بیەوێت لێی دەکات ،ئەو پیاوەش کە بینیت لەسەر پشتی کەوتبوو ئەوە پیـاوێـك بوو خوای گـەورە قورئـانی فێـر کـردووە ،شـەو بەسـەریدا خـەوی لـێ کـەوتووە بـەڕۆژیش کـاری پێنەکردووە ،بۆیە ئاوهای لێ دەکرێـت تـا ڕۆژی قیامـەت ،ئـەوەش کـە لـە تەنوورەکـەدا بینـیتن ئەوانە داوێن پیسن زینا بـازەکانن ،ئەوەش لە دەریاکەدا بینیت ئەوە سوو خـۆرە ،ئـەو پیـاوەش بینیت لە ژێر دارەکەدا بوو ئەوە ئیبراهیمە سەلامی خوای لێبێت ،منالەکانیش منـالی خەڵکی بـوون ،ئەو پیاوەش کە بینیت ئاگری دەکردەوە ، ئەوە گە نجینەوانی دۆزەخەو ،ئاگرەکەش دۆزەخ بوو ، یەکەم خانوویش کە چوویتە نـاوی خـانووی بڕوادارانـە بـە گـشتی ،خانووەکـەی تـریش خـانووی شەهیدانە ،منیش جیبریلم و ئەوەش میکائیلە ،ئینجا پێیان وتم : ئەوەش ماڵی تۆیە : پێم وتن : ڕێگەم بدەن بچمە ناوی ، وتیان ،هێشتا هەندێك لـە تەمـەنت مـاوە تـەواوت نـەکردووە ، ئەگـەر تەواوی کەیت دەچیتە ناوی .

( المشكاة ٤٦٢١ )

٧٥١٠- رأيت في المنام أني أهاجر من مكة إلى أرض بها نخل فذهب وهلي إلى أنها اليمامة أو هجر فإذا هي المدينة يثرب و رأيت في رؤياي هذه أني هززت سيفا فانقطع صدره فإذا هو ما أصيب من المؤمنين يوم أحد ثم هززته أخرى فعاد أحسن ما كان فإذا هو ما جاء الله به من الفتح و اجتماع المؤمنين و رأيت فيها بقرا و الله خير فإذا هم النفر من المؤمنين يوم أحد و إذا الخير ما جاء الله به من الخير بعد و ثواب الصدق الذي آتانا الله بعد يوم بدر.

( صحيح ) ( ق هـ ) عن أبي موسى.

**٧٥١٠- لە خەودا بینیم لە مەککە کۆچ دەکەم بۆ خاکێك دار خورمای تیایە ،وا بۆی چووم یەمامە یان هەجەرە[1] بێت ،بەلاَم دەرکەوت مەدینەیە** ( يثرب ) **،لە خەونەکەمدا بینیم شمشێرێکم ڕاوەشان و پێشەکەی بە دەستمەوە شکا ،ئەوەیش شکستی بڕواداران بوو لە ئوحود ،ئینجا جارێکی تر ڕام وەشاندەوە لە جاری یەکەم باشتر گەڕایەوە ،ئەوەیش فەتحی مەککەو کۆبوونەوەی بڕواداران بوو ،هەندێ مانگایشم تیا بینی ...ئەویش ئەو چەند کەسە بڕوادارە بوو لە ئوحود ،چاکەیش ئەوە بوو کە خوای گەورە پاش ئەوە هێنای ، پاداشتی ڕاستیش کە خوای گەورە پێی بەخشین لە پاش جەنگی بەدر .**

( صحيح ابن ماجة ٣٩٢١٠ )

٧٥١١- رأيت قوما ممن يركب ظهر هذا البحر كالملوك على الأسرة.

( صحيح ) ( د ) عن أم حرام.

**٧٥١١- کەسانێکم بینی لەوانەی سواری پشتی ئەو دەریا دەبن هەر وەکو چۆن پادشاکان لەسەر تەختەکانیان ( پاڵدەدەنەوە ) .**

( صحيح ابى داود ٢٢٤٩ )

٧٥١٢- رأيت كأن امرأة سوداء ثائرة الرأس خرجت من المدينة حتى نزلت مهيعة فأولتها أن وباء المدينة نقل إليها.

( صحيح ) ( خ ت هـ ) عن ابن عمر.

**٧٥١٢- لە خەونمدا ئافرەتێکم بینی ڕەش و قژ بژو تێکئالاَو ،لە مەدینەوە چووە دەر تاکو گەیشتە** ( مهيعة ) [2] **بەوە لێکمدایەوە دەرد و پەتای[3] مەدینە گوێزرایەوە بۆ ئەوێ .**

( المشكاة ٢٧٣٥ )

---

[1] **شارێکە لە بەحرێن**

[2] **جوحفەیە.**

[3] **وباو : پەتا ـ دەرد ـ نەخۆشی ـ تاعون ـ ڕشانەوە و سکچوون .**

٧٥١٣- رأيت كأني الليلة في دار عقبة بن رافع و أتيت بتمر من تمر ابن طاب فأولت أن لنا الرفعة في الدنيا و العاقبة في الآخرة و أن ديننا قد طاب.

( صحيح ) ( حم م د ن ) عن أنس.

**٧٥١٣- ئەمشەو بينيم لە خەونمدا چوومەتە ماڵى عوقبەى كوڕى رافيع لە خورماى** ( ابن طاب)[1] **يشيان بۆ هێنام ،بەوە لێكم دايەوە سەربەرز دەبێت لە دونيادا و ، پاشەڕۆژى باشيشمان دەبێت لە دوارۆژدا ،دينەكەيشمان تەواو و جێگير دەبێت و دەچەسپێت .**

( الكلم ٢٥٠ )

٧٥١٤- رأيت كأني في درع حصينة و رأيت بقرا تنحر فأولت أن الدرع الحصينة المدينة و أن البقر نفر و الله خير.

( صحيح ) ( حم ن الضياء ) عن جابر.

**٧٥١٤- لە خەونمدا بينيم وەكو لە قەڵغانێكى پتەودا بم وابوو و ،مانگام دەبينى سەر دەبڕان ،قەڵغانەكەم بە مەدينە لێكدايە وە و ،مانگاكانيش بە كۆمەڵ چەند كەسێك و، خواى گەورەيش چاكترە .**

( الصحيحة ١١٠٠ )

---

[1] **پياوێكى خەڵكى مەدينەيە .**

# پەراوی
# پشێوی و نیشانەکانی قیامەت

٧٥١٥- إذا رأيت الأمة ولدت ربتها و رأيت أصحاب البنيان يتطاولون بالبنيان و رأيت الحفاة الجياع العالة كانوا رءوس الناس فذلك من معالم الساعة و أشراطها.

( صحيح ) ( حم ) عن ابن عباس .

**٧٥١٥- ئەگەر بینیت ئافرەتێك كچەكەی خۆی بوویە[1] سەر گەورەی و ، خەڵكیت بینی خانووەكان بەرزدەكەنەوە و ، بینیت پێخاوسە برسیە هەژارەكان بوونە سەرداری خەڵك ، ئەوە لە نیشانەكان و مەشخەڵەكانی قیامەتە .**

( الصحيحة ١٣٤٥ )

٧٥١٦- إذا سمعتم بقوم قد خسف فيهم هاهنا قريبا فقد أظلت الساعة.

( صحيح ) ( حم الحاكم في الكنى طب ) عن بقيرة الهلالية .

**٧٥١٦- ئەگەر بیستان كەسانێك ئالێرەدا[2] چوون بەناخی زەویدا ، ئەوە بەڕاستی قیامەت نزیك بووەتەوە .**

( الصحيحة ١٣٥٥ )

٧٥١٧- إذا فسد أهل الشام فلا خير فيكم و لا تزال طائفة من أمتي منصورين لا يضرهم من خذلهم حتى تقوم الساعة

( صحيح ) ( حم ت حب ) عن قرة بن أياس .

---

[1] لەجیاتی ئازاردانی دایك و باوك ئەو دەقە خوازراوە ، لەگەڵ ئەوەشدا زاناكان بەچەند جۆرێك لێكیان داوەتەوە.

[2] واتە : لە ( بیداء )ناوی جێگایەكە لە مەدینە

**٧٥١٧-ئەگەر خەڵكی شام خراپ بوون ،ئیتر ئێوە خێرو بێرتان تیا نەماوە ،كۆمەڵێكیش لە ئومەتەكەم هەر سەركەوتوو دەبن و ،ئەوانەی پشتان لیٚ دەكەن زیانیان پیٚ ناگەیەنن ،تاكو قیامەت هەڵدەستیٚ .**

( المشكاة ٦٢٨٣ )

٧٥١٨- اعدد ستا بين يدي الساعة: موتي ثم فتح بيت المقدس ثم موتان يأخذ فيكم كقعاص الغنم ثم استفاضة المال حتى يعطى الرجل مائة دينار فيظل ساخطا ثم فتنة لا يبقى بيت من العرب إلا دخلته ثم هدنة تكون بينكم و بين بني الأصفر فيغدرون فيأتونكم تحت ثمانين غاية تحت كل غاية اثنا عشر ألفا.

( صحيح ) ( خ ) عن عوف بن مالك .

**٧٥١٨- شەش نیشانە بژمێرە پێش هاتنی قیامەت : مردنی من ،ئینجا فەتحی (بيت المقدس ) ،ئینجا مردنێكی زۆر [1] ،وەكو دەردە مەڕ لێتان دەكوژیٚ ،ئینجا ماڵ زۆری ، تەنانەت سەد دینار [2] دەدرێت بە كەسێك و هەر ناڕازییە ،ئینجا ئاژاوەیەك هیچ ماڵێكی عەرەبەوە نامێنێت كە نەچێتە ناوی ،ئینجا ئاشتیەك ڕوو دەدات لە نێوان ئێوەو ڕۆمەكان و ،ئەوان ناپاكیتان لەگەڵ دەكەن و لە ژێر هەشت ئالآدا دێن بۆتان ،لە ژێر هەموو ئالآیەكدا دوانزە هەزار كەس هەیە .**

( الطحاوية ٥٠٢ )

٧٥١٩- اقتربت الساعة و لا تزداد منهم إلا بعدا.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن مسعود .

**٧٥١٩- قیامەت نزیك بوویەوەو ،بەلاّم دووركەوتنەوە نەبێت بۆیان زیاد ناكات [3] .**

( الصحيحة ١٥١٠ )

٧٥٢٠- اقتربت الساعة و لا يزداد الناس على الدنيا إلا حرصا و لا يزدادون من الله إلا بعدا

( صحيح ) ( ك ) عن ابن مسعود .

---

[1] دەڵێی ئاماژەیەكە بۆ تاعوونی عەمواس

[2] واتە : سەد مسقاڵ ئاڵتون .

[3] مەناوی دەڵێت : واتە چەند لێیان نزیك دەبێتەوە ئەوان لە بیری دەكەن ،چونكە دڵەكانیان غافڵەو مۆركراوەو چاوەكانیان ڕاستی نابینیٚ .

**٧٥٢٠- قیامەت نزیك بووەتەوە و ،خەڵکی بۆ باوەشکردن بە دونیادا هەر پەرۆشتر دەبن و ،تاکو دێت لە خوایش دوور تر دەکەونەوە .**

( الصحيحة ١٥١٠ )

٧٥٢١- أما أول أشراط الساعة فنار تخرج من المشرق فتحشر الناس إلى المغرب و أما أول ما يأكل أهل الجنة فزيادة كبد الحوت و أما شبه الولد أباه و أمه فإذا سبق ماء الرجل ماء المرأة نزع إليه الولد و إذا سبق ماء المرأة ماء الرجل نزع إليها.

( صحيح ) ( حم خ ن ) عن أنس .

**٧٥٢١- یەکەمین نیشانەکانی قیامەت ئاگرێکە لە ڕۆژهەڵاتەوە سەر هەڵدەدات ،خەڵکی کۆدەکاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا ،یەکەمین شتیش خەڵکی بەهەشت دەیخۆن زیادەی جگەری حوتە ،سەبارەت بە لێکچوونی منداڵیش بە دایك و باوکی ،ئەگەر ئاوی پیاو بکەوێتە پێش ئاوی ئافرەت منداڵ لە باوکی دەکات ،ئەگەر ئاوی ئافرەتیش بکەوێتە پێش ئاوی پیاو منداڵ لە دایکی دەکات .**

( الصحيحة ٣٤٩٧ )

٧٥٢٢- إن يعش هذا الغلام فعسى أن لا يبلغ الهرم حتى تقوم الساعة

( صحيح ) ( م ) عن أنس وعن المغيرة وعن عائشة .

**٧٥٢٢- ئەگەر ئەم لاوە تەمەنی پێ ببەخشرێت ،بەڵکو نەگاتە پیری تاکو قیامەت بەرپا دەبێت .**

٧٥٢٣- إن الساعة لا تقوم حتى تكون عشر آيات: الدخان و الدجال و الدابة و طلوع الشمس من مغربها و ثلاثة خسوف: خسف بالمشرق و خسف بالمغرب و خسف بجزيرة العرب و نزول عيسى و فتح يأجوج و مأجوج و نار تخرج من قعر عدن تسوق الناس إلى المحشر تبيت معهم حيث باتوا و تقيل معهم حيث قالوا

( صحيح ) ( حم م ٤ ) عن حذيفة بن أسيد .

**٧٥٢٣- قیامەت هەڵناسێت تا دە نیشانە ڕوو نەدات : دووکەڵ و ،دەججال و ،گیانداری زەوی و ،هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە و ،سێ ڕۆچوون و داڕووخان یەکێك لە ڕۆژهەڵات و یەکێك لە ڕۆژئاواو ،یەکێك لە نیوە دوورگەی عەرەب و ،هاتنە خوارەوەی عیسا و ، دەرچوونی یەئجووج و مەئجووج و ،ئاگرێکیش لە ناو جەرگەی عەدەنەوە دەرکەوێتەوە**

**و، خـەڵكى بـەر خـۆ دەدات بـەرەو گۆڕەپـانى مەحـشەر[1]، شـەو لەگـەڵیان دەمێنێتـەوە (قەیلولە) خەوى چێشتەنگاویش لەگەڵیان دەبێت لە هەركوێ بن .**

( المشكاة ٥٤٦٤ )

٧٥٢٤- إن السعيد لمن جنب الفتن و لمن ابتلي فصبر.

( صحيح ) ( د ) عن المقداد .

**٧٥٢٤- بەڕاستى بەختەوەر ئەوەیە دورە پەرێزى لە ئاژاوە بكات و لە تاقیكردنەوەدا بەئارام بێت.**

( الصحيحة ٩٧٣ )

٧٥٢٥- إن أول الآيات خروجا طلوع الشمس مـن مغربهـا و خـروج الدابـة علـى النـاس ضـحى فأيتهما ما كانت قبل صاحبتها فالأخرى على أثرها قريبا.

( صحيح ) ( حم م د هـ ) ابن عمرو .

**٧٥٢٥- بەڕاستى هاتنى یەكەمین نیشانەكانى قیامەت هەڵهاتنى خۆرە لە خۆرئاواوە و، دەرچوونى( ولاخ گیاندارى زەویە بۆ خەڵكى لە چێشتەنگاودا ،هـەركامیان پێـشتر هـات ئەوى تریان بەدوایدا دێت .**

( الطحاوية ٥٠٤ )

٧٥٢٦- إن بين يدي الساعة الهرج: القتل ما هو قتل الكفار و لكـن قتـل الأمـة بعـضها بعـضا حتى أن الرجل يلقاه أخوه فيقتله ينتزع عقول أهل ذلـك الزمـان و يخلـف لهـا هبـاء مـن النـاس يحسب أكثرهم أنهم على شيء و ليسوا على شيء.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن أبي موسى .

**٧٥٢٦- لە پێش قیامەت كوشت و بڕ ڕوودەدات ، نەك كوشتنى بێباوەڕان ،بەڵكو كوشتنى ئەم ئوممەتە لە نـاو خۆیـادا ،تەنانـەت كەسـى وا هەیـە براكـەى خـۆى دەكوژێت ،بـیرو هۆشـى خـەڵكى ئـەو زەمانـە ڕادەكێـشێ و هەنـدێ خـەڵكى ڕەنجـە ڕۆیـان بـۆ جـێ دەهێڵێت،زۆربەیان وادەزانن لەسەر شتێك باش و لەسەر هیچیش نین .**

( الصحيحة ١٦٨٢ )

٧٥٢٧- إن بين يدي الساعة ثلاثين دجالا كذابا

( صحيح ) ( حم ) عن ابن عمر .

---

[1] لە شام .

٧٧٠٤- ستكون فتنة القاعد فيها خير من القائم و القائم فيها خير من الماشي و الماشي فيها خير من الساعي قيل: أفرأيت يا رسول الله إن دخل علي بيتي و بسط إلي يده ليقتلني ؟ قال: كن كابن آدم.

( صحيح ) ( حم د ت ك ) عن سعد.

**٧٧٠٤- لەمەودوا ئاژاوە سەرهەڵدەدا ،دانیشتوو تیایدا چاکترە لە ڕاوەستاو ،ڕاوەستاویش تیایدا چاکترە لە پیادە ، پیادەش چاکترە لەوەی کە بە خێرایی بەرەو پیری ئەچێت ،وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر هاتە ماڵەکەم و ،دەستی بۆ درێژکردم بم کوژێت ؟ فەرمووی وەکو کوڕەکەی ئادەم بکە** [1].

( ألارواء ٢٤٤٥ )

٧٧٠٥- سلامة الرجل في الفتنة أن يلزم بيته.

( صحيح ) ( فر أبو الحسن بن المفضل المقدسي في الأربعين المسلسلة ) عن أبي موسى.

**٧٧٠٥- بێوەیی پیاو لە کاتی پشێویدا ئەوەیە وابەستەی ماڵی خۆی بێت .**

( الصحيحة ١٥٢٤ )

٧٧٠٦- سيأتي على الناس سنوات خداعات يصدق فيها الكاذب و يكذب فيها الصادق و يؤتمن فيها الخائن و يخون فيها الأمين و ينطق فيها الرويبضة قيل: و ما الرويبضة ؟ قال: الرجل التافه يتكلم في أمر العامة.

( صحيح ) ( حم هـ ك ) عن أبي هريرة.

**٧٧٠٦- ساڵانێکی خەڵەتێنەر دێن بەسەر خەڵکیدا ،درۆزنی تیا بە ڕاستگۆ دادەنرێت و ،ڕاستگۆی تیا بە درۆ دادەنرێت و ،ناپاکیشی تیا دەکرێتە جێگای متمانەی و ،دەست پاکیشی تیا بە ناپاک دەژمێرێت و ( روبیضة - ناکەسبەچە )ی تیا دێتە گۆ ،وتیان : ناکەسبەچە ( روبیضة ) چی یە ؟ فەرمووی پیاوی پڕوو پووچ کە قسە دەکات دەربارەی کاروباری گشتی .**

( الصحيحة ١٨٨٨ )

---

[1] **ئەم جۆرە فەرموودانە پێویستی بە وردبوونەوەو بەراوردی زۆر هەیە لە لایەن زانایانەوە لە ڕووی سەنەدو ناوەڕۆکیشەوە ،چونکە لەگەڵ هەندێ بنەمای ئیسلامی بە هێزدا ناکۆکی هەیە وەکو بەرپەرچدانەوەی دەست درێژی کە لە قورئاندا هاتووە بۆیە پێویستە لە لایەن زانایانی پسپۆڕەوە شیبکرێتەوەو ئینجا کاریان پێبکرێت ( وەرگێڕ )**

٧٧٠٧- أظلتكم فتن كقطع الليل المظلم أنجى الناس منها صاحب شاهقة يأكل من رسل غنمه أو رجل من وراء الدروب أخذ بعنان فرسه يأكل من ظل سيفه.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة .

**٧٧٠٧- ئاژاوە داتان دەپۆشێ ،لە چەشنی تاریکی شەو ،کەسێکی بە باشی لێ ڕزگاردەبێت کە بەسەر شاخێکەوەیەو لە شیری مەڕەکانی دەخوات ،یان پیاوێك لە کون و کەلەبەر ڕێگاکان شاخ و داخەکانی هەوساری ئەسپەکەی گرتبێت و لە سایەی شمشێرەکەیدا خواردن بخوات .**

( الصحيحة ١٤٧٨ )

٧٧٠٨- طوبى لعيش بعد المسيح يؤذن للسماء في القطر و يؤذن للأرض في النبات حتى لو بذرت حبك على الصفا لنبت و حتى يمر الرجل على الأسد فلا يضره و يطأ على الحية فلا تضره و لا تشاح و لا تحاسد و لا تباغض .

( صحيح ) ( أبو سعيد النقاش في فوائد العراقيين ) عن أبي هريرة.

**٧٧٠٨- خۆش بەختی بۆ ژیانی لە دوای هاتنی مەسیح ، فەرمان دەدرێت بە ئاسمان باران ببارێنێت و ،فەرمان بە زەوی دەکرێت ڕووەك بڕوێنێت ، تەنانەت ئەگەر تۆوەکەت لەسەر تاوێری لووس بچێنێ دەڕوێت ، و پیاو بەلای شێردا تێدەپەڕێت و زیانی پێی ناگەیەنێت، یان پێ دەخاتە سەر مارو زیانی پێناگەیەنێت ،ڕق و قین و چاو لە ماڵێ یەکتر بڕین و ڕق لە یەکتر بوونیش نامێنێت .**

( الصحيحة ١٩٢٦ )

٧٧٠٩- عبادة في الهرج و الفتنة كهجرة إلي .

( صحيح ) ( طب ) عن معقل بن يسار.

**٧٧٠٩- خوا پەرستی لە کاتی کوشتو بڕو ئاژاوەدا ،وەکو کۆچکردنە بۆلای من .**

( الترغيب ٣١٧٣ )

٧٧١٠- العبادة في الهرج كهجرة إلي .

( صحيح ) ( حم م ت هـ ) عن معقل بن يسار.

**٧٧١٠- خوا پەرستی لە کاتی کوشت و بڕدا وەکو کۆچکردن بۆ لای من .**

( الترغيب ٣١٧٣ )

٧٧١١- العجب أن ناسا من أمتي يؤمون البيت لرجل من قريش قد لجأ بالبيت حتى إذا كانوا بالبيداء خسف بهم فيهم المستبصر و المجبور و ابن السبيل يهلكون مهلكا واحدا و يصدرون مصادر شتى يبعثهم الله على نياتهم .

( صحيح ) ( م ) عن عائشة.

**٧٧١١- سەیر ئەوەیە خەڵکانێك لە ئوممەتم ڕوودەکەنە کەعبە بۆ پیاوێك لە قوڕەیش کە پەنای بردووەتە ئەوێ ،تاکو دەگەنە بیابان خوای گەورە دەیانبات بە ناخی زەویدا، شارەزاو ناچارو ڕێبواریان تیایە هەموویان بەیەکەوە ،لە یەك جێگەدا تیا دەچن ، هەریەکەو لە لایەکیشەوە هاتوون ،خوای گەورە لەسەر نیەتەکانیان زیندوویان دەکاتەوە.**

( الصحيحة ١٩٢٤ )

٧٧١٢- في أمتي خسف و مسخ و قذف.

( صحيح ) ( ك ) عن ابن عمرو.

**٧٧١٢-لە ئوممەتەکەمدا ،ڕۆچوون و ،شێواندن و ،بەردباران ڕوو دەدات .**

( الروض ١٠٠٤ )

٧٧١٣- في أمتي كذابون و دجالون سبعة و عشرون منهم أربع نسوة و إني خاتم النبيين لا نبي بعدي.

( صحيح ) ( حم طب الضياء ) عن حذيفة.

**٧٧١٣- لە ئوممەتی مندا بیست و حەوت درۆزن و تەڵەکەباز هەیە ،چواریان ئافرەتن ، منیش کۆتایی پێغەمبەرانم ، لە دوای من پێغەمبەر نییە.**

( الصحيحة ١٩٩٩ )

٧٧١٤- إن في مال الرجل فتنة وفي زوجته فتنة و ولده.

( صحيح ) ( طب ) عن حذيفة .

**٧٧١٤- بەڕاستی لە ماڵ و هاوسەرو منداڵی پیاودا تاقیکردنەوە هەیە .**

٧٧١٥- إن لكل أمة فتنة و إن فتنة أمتي المال.

( صحيح ) ( ت ك ) عن كعب بن عياض .

**٧٧١٥- هەموو ئوممەتێك تاقیکردنەوەیەکی هەیە ،تاقیکردنەوەی ئوممەتی منیش بە ماڵ و سامانە .**

( الصحيحة ٥٩٤ )

٧٧١٦- إنها ستكون فتن ألا ثم تكون فتنة المضطجع فيها خير من الجالس و الجالس فيها خير من القائم و القائم فيها خير من الماشي و الماشي فيها خير من الساعي إليها ألا فإذا نزلت أو وقعت فمن كانت له إبل فليلحق بإبله و من كانت له غنم فليلحق بغنمه و من كانت له أرض فليلحق بأرضه و من لم يكن له شيء من ذلك فليعمد إلى سيفه فيدق على حده بحجر ثم لينج إن استطاع النجاء اللهم هل بلغت اللهم هل بلغت.

( صحيح ) ( حم م د ) عن أبي بكرة .

**٧٧١٦- لە داهاتوودا ئاژاوە دروست دەبێت ،بەڵێ ئاگاداربن ئاژاوە هەر دروست دەبێت ، ڕاکشاو تیایدا چاکترە لە دانیشتوو ،دانیشتوویش تیایدا چاکترە لە ڕاوەستاو ، ڕاوەستاویش تیایدا چاکترە لە پیادە ، پیادەش تیایدا چاکترە لەو کەسەی هەڵپەی دەکات ، جا کاتێك سەریهەڵدا یان ڕوویدا،هەرکەس خاوەن وشترە با بچێت بۆ لای وشترەکانی و ،هەرکەس خاوەن مەڕە بابچێت بۆ لای مەڕەکانی و ،هەرکەس زەوی هەیە با بچێتەوە لای زەویەکەی ،هەرکەسیش هیچی نییە لەو شتانە با بەردێك بیغی شمشێرەکەی بکوتێتەوە ،ئینجا ئەگەر توانی با خۆی ڕزگار بکات ،ئەرێ خوایە گیان ڕامگەیاند ،ئەرێ خوایە ڕامگەیاند .**

( المشكاة ٥٣٨٥ )

٧٧١٧- إنها ستكون فتنة القاعد فيها خير من القائم و القائم خير من الماشي و الماشي خير من الساعي قيل: أفرأيت إن دخل علي بيتي قال: كن كابن آدم.

( صحيح ) ( د ) عن سعد .

**٧٧١٧- بەڕاستی لە داهاتوودا ئاژاوە سەرهەڵدەدات ڕاکشاو تیایدا چاکترە لە دانیشتوو ،دانیشتووی تیایدا چاکترە لە ڕاوەستاو ،ڕاوەستاویش چاکترە لە پیادە ، پیادەش چاکترە لەو کەسەی هەڵپەی بۆ دەکات ،وتیان : ئەگەر هاتە ماڵەکەمەوە ؟ فەرمووی : وەکو کوڕەکەی ئادەم بە .**

( صحيحة الترمذي ٢١٩٤ )

٧٧١٨- إنها ستكون فتنة و فرقة و اختلاف فإذا كان ذلك فائت بسيفك أحدا فاضربه حتى ينقطع ثم اجلس في بيتك حتى يأتيك يد خاطئة أو منية قاضية.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن محمد بن مسلمة .

**٧٧١٨- لە داهاتوودا پشێوى و جياخوازى و جياجيايى دروست دەبێت ،جا لەو كاتە شمشێرەكەت بهێنە لاى كێوى ئوحود و پيا بكێشە تا دەى شكێنى ،ئينجا لە ماڵى خۆت دانيشە تاكو دەستێكى هەڵە دێتە سەرت ،يان مردنێكى لە ناو بەر .**

( الصحيحة ١٣٨٠ )

٧٧١٩- ويل للعرب من شر قد اقترب أفلح من كف يده.

( صحيح ) ( د ك ) عن أبي هريرة.

**٧٧١٩- واوەيلا بۆ عەرەب لە خراپەيەك كە لێيان نزيك بووەتەوە،سەرفرازە ئەو كەسە تێوە نەگلێ .**

( المشكاة ٥٤٠٤ )

٧٧٢٠- لا تذهب الدنيا حتى تصير للكع بن لكع.

( صحيح ) ( حم ) عن أبي هريرة.

**٧٧٢٠- دونيا تەواو نابێت تاكو نەبێتە موڵكى نارەسەنى كوڕى نارەسەن .**

( المشكاة ٥٤٠٤ )

٧٧٢١- لا تذهب الأيام و الليالي حتى تشرب طائفة من أمتي الخمر يسمونها بغير اسمها.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي أمامة.

**٧٧٢١- ڕۆژان و شەوان نابڕێنەوە تاكو كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەم ئارەق نەخۆن و ناوێكى ترى لێنەنێن .**

( الصحيحة ٩١ )

٧٧٢٢- لا تذهب الأيام و الليالي حتى يملك رجل يقال له الجهجاه.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٧٢٢- ڕۆژان و شەوان نابڕێنەوە تاكو كەسێك بەناوى ( الجهجاه )ەوە نەبێە پادشا .**

( المشكاة ٥٤١٦ )

٧٧٢٣- لا تذهب الدنيا و لا تنقضي حتى يملك رجل من أهل بيتي يواطئ اسمه اسمي.

( صحيح ) ( حم د ت ) عن ابن مسعود.

**٧٧٢٣- دونيا ناگوزەرێ و تەواو نابێت هەتا پياوێك لە خاو خانەوادەكەم نەبێتە سەركردە ،ناوى وەكو ناوى منە .**

( المشكاة ٥٤٥٢ )

٧٧٢٤- لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض.

( صحيح ) ( حم ق ن هـ ) عن جرير ( حم خ د ن هـ ) عن ابن عمر ( خ ن ) عن أبي بكرة ( خ ت ) عن ابن عباس.

**٧٧٢٤- لە پاش من مەبنەوە بێباوەڕ هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن .**

( الروض ٧٩٧ )

٧٧٢٥- لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض و لا يؤخذ الرجل بجريرة أبيه و لا بجريرة أخيه.

( صحيح ) ( ن ) عن ابن عمر.

**٧٧٢٥- لە پاش من مەگەڕێنەوە بۆ بێباوەڕی هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن ، پیاویش بە تاوانی باوکی یان براکەی نابێت سزا بدرێت .**

( الصحيحة ١٩٧٤ )

٧٧٢٦- ويحكم ! لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض.

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمر.

**٧٧٢٦- بەلآتان لێدات ! لە پاش من مەبنەوە بێباوەڕ لە گەردنی یەکتر بدەن .**

( صحيحة ابن ماجة ٣٩٤٣ )

٧٧٢٧- يتقارب الزمان و يقبض العلم و يلقى الشح و تظهر الفتن و يكثر الهرج قيل: وما الهرج؟ قال: القتل.

( صحيح ) ( حم ق د ) عن أبي هريرة

**٧٧٢٧- کات و سەردەم نزیك دەبێتەوەو زانست وەردەگیرێتەوەو ، چرووکی پەیدا دەبێت و ، ئاژاوە سەر هەڵدەدات و ،کوشتوبڕ زۆر دەبێت .**

( المشكاة ٥٣٨٩ )

٧٧٢٨- يقبض العلم و يظهر الجهل و الفتن و يكثر الهرج

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة

**٧٧٢٨- زانست وەردەگیرێتەوە و ،نەفامی و ئاژاوە بڵاو دەبێتەوە و ،کوشتوبڕ زۆر دەبێت .**

( المشكاة ٥٣٨٩)

٧٧٢٩- يوشك أن يكون خير مال المسلم غنما يتبع بها شعف الجبال و مواقع القطر يفر بدينه من الفتن.

( صحيح ) ( حم خ د ن هـ ) عن أبي سعيد.

**٧٧٢٩- زیك بۆتەوە چاکترین ماڵی موسڵمان ببێتە ڕانەمەڕ و لە چڵە پۆپی شاخەکاندا بیانلەوەڕێنێ و ،بەدوای لەوەڕگەدا بگەڕێت ،مەبەستی هەڵهاتن بێت بە ئایینەکەیەوە لەدەست ئاژاوە .**

( المشكاة ٥٣٨٩ )

٧٧٣٠- يوشك يا معاذ إن طالت بك حياة أن ترى ما هاهنا قد ملئ جنانا.

( صحيح ) ( حم م ) عن معاذ بن جبل.

**٧٧٣٠- نزیکە ئەی ( معاذ ) ئەگەر تەمەنت درێژ بێتەوە ئا ئێرە[1] ببینیت بووەتە باخ و باخات .**

( الصحيحة ١٢١٠ )

٧٧٣١- لن يعجز الله هذه الأمة من نصف يوم.

( صحيح ) ( د ك ) عن أبي ثعلبة.

**٧٧٣١- هەرگیز خوا دەوڵەمەندی ئەم ئومەتە نیو ڕۆژ زیاتر دواناخات لە هەژارەکان بۆ ناو بەهەشت[2]**

٧٧٣٢- ما تركت بعدي فتنة أضر على الرجال من النساء.

( صحيح ) ( حم ق ت ن هـ ) عن أسامة.

**٧٧٣٢- لە پاش خۆم تاقیکردنەوەیەکم بەجێ نەهێشتوو زیانبەخشتر بێت لە ژنان بۆ پیاوان .**

( الصحيحة ٢٧٠١ )

٧٧٣٣- المهدي من عترتي من ولد فاطمة.

( صحيح ) ( د هـ ك ) عن أم سلمة.

**٧٧٣٣- مەهدی لە خاوو خێزانی منە لە نەوەی فاتیمە یە .**

( المشكاة ٥٤٥٣ )

٧٧٣٤- المهدي منا أهل البيت يصلحه الله في ليلة.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن علي.

**٧٧٣٤- مەهدی لە ئێمەیە لە ( اهل البيت ) خوای گەورە لە شەوێکدا کاروباری ڕێك دەخات[3].**

( الصحيحة ٢٣٧١ )

---

[1] واتە (تبوك )

[2] شرح سنن ابي دود عبد المحسن عباد ، وعون المصبود شرح سنن ابي داود ، ج١١ ص٣٤١ .

[3] کارو باری ڕێك دەخات و موڵکی بۆ دەستە پێنێ ،یان ئەوە دەگەیەنێنێت یاخی یەو خوای گەورە ڕێنموونی دەکات .

٧٧٣٥- المهدي مني أجلى الجبهة أقنى الأنف يملأ الأرض قسطا و عدلا كما ملئت جورا و ظلما يملك سبع سنين.

( صحيح ) ( د ك ) عن أبي سعيد.

**٧٧٣٥- مەهدی لە منە ، پێشەسەری ڕووتەو ، لووتی درێژە ،سەر زەوی پڕ دەکات لە دادگەری و دادپەروەری ،وەکو چۆن پڕ کرا بوو لە زۆر و ستەم ،حەوت ساڵ پادشایی دەکات .**

( الروض ٢ م ٥٣ )

٧٧٣٦- هل ترون ما أرى ؟ إني لأرى مواقع الفتن خلال بيوتكم كمواقع القطر.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أسامة.

**٧٧٣٦- ئایا ئەوەی من دەیبینم ئێوەش دەیبینن ؟ من جێگاکانی ئاژاوە دەبینم لە نێو ماڵەکانتانەوە ،وەکو جێگای دڵۆپە باران .**

( المشكاة ٥٣٨٧ )

٧٧٣٧- هلاك أمتي على يدي غلمة من قريش.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي هريرة.

**٧٧٣٧- لە نێو چوونی ئوممەتم لەسەر دەستی چەند لاوێکی لە قوڕەیشی دەبێت .**

( الروض ١١٥٧ )

٧٧٣٨- إن الله تعالى يبعث ريحا من اليمن ألين من الحرير فلا تدع أحدا في قلبه مثقال حبة من إيمان إلا قبضته.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة .

**٧٧٣٨- خوای گەورە بایەك دەنێرێت لە یەمەنەوە نەرمترە لە ئاوریشم ،کەس نایەڵێتەوە لەسەر زەوی بە ئەندازەی گەردیلەیەك باوەڕی لە دڵابێت تاکو نەیکوژێت .**

( الصحيحة ١٦٥٩ )

٧٧٣٩- تخرج الدابة فتسم الناس على خراطيمهم ثم يعمرون فيكم حتى يشتري الرجل الدابة فيقال: ممن اشتريت ؟ فيقول: من الرجل المخطم.

( صحيح ) ( حم ) عن أبي أمامة .

**٧٧٣٩- پاژەڵى زەوى پەیدا دەبێت و ،نیشانە دەخاتە سەر لووتى خەڵکى ،ئینجا ئەوانە ئەوەندە تەمەن درێژ دەبن ،تاکو پیاو ئاژەڵێك دەکرێت و دەوترێت لە کێت کرى ؟ ئەویش دەڵێت : لە پیاوە لوت نیشانە کراوەکە .**

( الصحيحة ٣٢٢ )

٧٧٤٠- ستصالحون الروم صلحا أمنا فتغزون أنتم و هم عدوا من ورائهم فتسلمون و تغنمون ثم تنزلون بمرج ذي تلول فيقوم رجل من الروم فيرفع الصليب و يقول: غلب الصليب ! فيقوم إليه رجل من المسلمين فيقتله فيغدر القوم و تكون الملاحم فيجتمعون لكم فيأتونكم في ثمانين غاية مع كل غاية عشرة آلاف.

( صحيح ) ( حم د هـ حب ) عن ذي مخمر.

**٧٧٤٠- رێکەوتن دەکەن لەگەڵ ڕۆمەکاندا ،جا ئێوەو ئەوان غەزاى دوژمنێك دەکەن کە لە دوایانەوەیە ،ئیتر ئێوە سەلامەت دەبن و دەسکەوتتان دەبێت ،ئینجا لە** ( مرج ذى تلول ) **دادەبەزن و ، پیاوێك لە ڕۆمەکان هەڵدەسێت و خاچ بەرز دەکاتەوەو دەڵێت : خاچ زاڵ بوو ! ئیتر کەسێك لە موسڵمانان هەڵدەسێت و دەیکوژێت ،ئینجا ئەوان ناپاکى دەکەن و ، شەڕو ئاشوب دروست دەبێت ،ئەوانیش کۆدەبنەوە بۆتان و لە ژێر هەشتا ئاڵادا دێن ، هەموو ئاڵایەکدا دە هەزار کەسى لەگەڵدایە .**

( المشكاة ٥٤٢٨ )

٧٧٤١- ستفتح عليكم الدنيا حتى تنجدوا بيوتكم كما تنجد الكعبة فأنتم اليوم خير من يومئذ.

( صحيح ) ( طب ) عن أبي جحيفة.

**٧٧٤١- دونیا باوەشتان بۆ دەکاتەوە ،تاکو ماڵەکانتان دەڕازێننەوە وەکو کەعبە ،ئێوە ئەمڕۆ لەو ڕۆژە چاکترن.**

( الصحيحة ١٨٨٣ )

٧٧٤٢- ستكون أئمة من بعدي يقولون فلا يرد عليهم قولهم يتقاحمون في النار كما تقاحم القردة

( صحيح ) ( ع طب ) عن معاوية

**٧٧٤٢- پێشەوایانێك لە دواى من دێن ،دەڵێن و ،وەڵام نادرێنەوە ، پاڵە پەستۆ دەکەن و خۆیان دەخەنە ناو دۆزەخەوە وەکو چۆن مە یمون پاڵە پەستۆ دەکەن.**

( الصحيحة ١٧٩٠ )

٧٧٤٣- سيخرج في آخر الزمان قوم أحداث الأسنان سفهاء الأحلام يقولون من خير قول البرية يقرءون القرآن لا يجاوز حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية فإذا لقيتموهم فاقتلوهم فإن في قتلهم أجرا لمن قتلهم عند الله يوم القيامة.

( صحيح ) ( ق ) عن علي.

**٧٧٤٣- لە كۆتایی زەمانەدا کەسانێك پەیدا دەبن ،تەمەن منالْ و ،نادان و هەرزەترین، بە چاكترین شێوازی قسەی خەڵكی قسە دەكەن ،قورئان دەخوێنن لە قورگیان تێ ناپەڕێت ،،لە ئیسلام دەردەچن وەكو چۆن تیر لە كەوانەكەی دەردەچێت ،جا ئەگەر ئەوانەتان بینی بیانكوژن ، چونكە كوشتنیان بۆ بكوژەكەیان دەبێتە یاداشت لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( ألارواء ٢٥٣٦ )

٧٧٤٤- سيكون في آخر الزمان خسف و قذف و مسخ إذا ظهرت المعازف و القينات و استحلت الخمر.

( صحيح ) ( طب ) عن سهل بن سعد.

**٧٧٤٤- لە كۆتایی زەمانەدا ڕۆچوون و بەردباران و شێواندن پەیدا دەبێت ،كاتێك ئەگەر ئامێری مۆسیقا ژەنین و ئافرەتی گۆرانی بێژ و ،ئارەق بە ڕەوا دانران .**

( الروض ١٠٠٤ )

٧٧٤٥- سيكون في آخر الزمان شرطة يغدون في غضب الله و يروحون في سخط الله.

( صحيح ) ( طب ) عن أبي أمامة.

**٧٧٤٥- لە كۆتایی زەماندا دارو دەستەیەك پەیدا دەبن بۆ پادشاكان بەیانی و ئێوارە لە ڕق و قینی خوای گەورەدا بەسەر دەبەن .**

( الصحيحة ١٨٩٣ )

٧٧٤٦- سيكون في آخر الزمان ناس من أمتي يحدثونكم بما لم تسمعوا به أنتم و لا آباؤكم فإياكم و إياهم.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٧٤٦- لە كۆتایی دونیادا کەسانێك لە ئوممەتەكەم هەندێ قسەتان بۆ دەكەن ،نە ئێوەو نە باو باپیرانتان شتی واتان نەبیستووە ،جا نەكەن گوێیان بۆ بگرن .**

( المشكاة ١٥٤ )

٧٧٤٧- سيكون في أمتي اختلاف و فرقة قوم يحسنون القيل و يسيئون الفعل يقرءون القرآن لا يجاوز تراقيهم يمرقون من الدين مروق السهم من الرمية لا يرجعون حتى يرتد على فوقه هم شرار

الخلق و الخليقة طوبى لمن قتلهم و قتلوه يدعون إلى كتاب الله و ليسوا منه في شيء من قاتلهم كان أولى بالله منهم سيماهم التحليق.

( صحيح ) ( د ك ) عن أبي سعيد وأنس معا ( حم د هـ ك ) عن أوس وحده.

**٧٧٤٧- لە ئوممەتەكەمدا ناكۆكی و جیاوازی دروست دەبێت ،كەسانێك پەیدا دەبن قسەیان جوان و كردەوەیان ناشرینە ،قورئان دەخوێنن و لە چەڵەمەی سنگیان تێپەڕ نابێت ،لە ئاین دەردەچن هەروەكو چۆن تیر لە كەوان دەردەچێت ،ناگەڕێنەوە تاكو ئەو تیرە نەگەڕێتەوە جێگای خۆی ،ئەوانە خراپترین خەڵكن ،خۆشی بۆ كەسێك بیانكوژێت یان ئەوان بیكوژن ،بانگەوا ز دەكەن بۆ قورئان و لە قورئانیشەوە دوورن ،هەركەس جەنگیان لەگەڵ بكات لە پێشترن و نزیكترن لە خوای گەورە لە ئەوان ، سەروسیمایان ئەوەیە رشیشیان دەتاشن .**

( المشكاة ٣٥٤٣ )

٧٧٤٨- سيكون قوم يأكلون بألسنتهم كما تأكل البقر من الأرض.

( صحيح ) ( حم ) عن سعد.

**٧٧٤٨- كەسانێك پەیدا دەبن بە زمانیان خواردن و بژێوی پەیدا دەكەن هەروەكو چۆن مانگا بەزمانی خواردنی زەوی دەخوات .**

( الصحيحة ٤١٩ )

٧٧٤٩- سيلي أموركم من بعدي رجال يعرفونكم ما تنكرون و ينكرون عليكم ما تعرفون فمن أدرك ذلك منكم فلا طاعة لمن عصى الله عز و جل.

( صحيح ) ( طب ك ) عن عبادة بن الصامت.

**٧٧٤٩- كەسانێك لە پاش من دەبنە بەرپرستان شتانێكتان پێدەڵێن كە ئێوە نكۆڵی لێدەكەن و ،نكۆڵی لە شتانێك دەكەن كە ئێوە بە باشی دەزانن ،جا هەركەسێكتان فریای ئەو رۆژگارە كەوت با گوێڕایەڵیان نەكات ،چونكە گوێڕایەڵی ڕەوا نییە بۆ كەسێك لە خوای گەورە یاخی بێت .**

( الصحيحة ٥٩٢ )

٧٧٥٠- لا تسألوني عن شيء إلى يوم القيامة إلا حدثتكم.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أنس.

**٧٧٥٠- پرسیاری هەرچیم لێ بكەن هەتا ڕۆژی قیامەت وەلاٌمتان دەدەمەوە .**

٧٧٥١- يا أبا ذر ! هل تدري أين تذهب الشمس إذا غابت ؟ فإنها تذهب حتى تأتي العرش فتسجد بين يدي ربها فتستأذن في الرجوع فيأذن لها و كأنها قد قيل لها: ارجعى من حيث جئت فتطلع من مغربها فذلك مستقرها.

( صحيح ) ( حم ق ٣ ) عن أبي ذر.

**٧٧٥١- ئەی** ( أبو ذر ) **! ئایا دەزانیت خۆر بۆ كوێ دەچێت لە پاش ئاوابوونی ؟دەڕوات تاكو دەگاتە عەرش و ،لەبەردەستی خوای خۆیدا كڕنووش دەبات ،ئینجا داوای مۆڵەت دەكات بۆ گەڕانەوەی و مۆڵەتی دەدرێت ،وەكو بلٌێی پێی وترابێت ،لەو جێگەیەوە بگەڕێرەوە كە لێی هاتی ،ئیتر لە ڕۆژئاواوە هەلٌدێت ئیتر ئەوە جێگای جێگیر بوونیەتی .**

( المشكاة ٥٤٦٨ )

٧٧٥٢- يأتي في آخر الزمان قوم حدثاء الأسنان سفهاء الأحلام يقولون من خير قول البرية يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية لا يجاوز إيمانهم حناجرهم فاقتلوهم فإن في قتلهم أجرا لمن قتلهم يوم القيامة.

( صحيح ) ( خ د ت ) عن علي.

**٧٧٥٢- لە كۆتایی دونیادا كەسانێكی تەمەن منالٌی نادان پەیدا دەبن ،كام قسە زۆر جوانە لە قسەی خەلٌكی ئەو قسەیە دەكەن ،ئەوان لە ئیسلام دەردەچن ،وەكو چۆن تیر لە كەوانەكەی دەردەچێت ،بڕوایان لە قوڕگیان تێپەڕ نابێت ،بیانكوژن چونكە بە كوشتنی ئەوان ئەو كەسە كە دەیانكوژێ پاداشت دەدرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( المشكاة ٣٥٣٥ )

٧٧٥٣- يخرج في آخر الزمان قوم أحداث الأسنان سفهاء الأحلام يقرءون القرآن بألسنتهم لا يجاوز تراقيهم يقولون من قول خير البرية يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية فمن لقيهم فليقتلهم فإن في قتلهم أجرا عظيما عند الله لمن قتلهم.

( صحيح ) ( حم ت هـ ) عن ابن مسعود.

**٧٧٥٣- لە كۆتایی دونیادا كەسانێكی تەمەن منالٌی هەرزەی نادان پەیدا دەبن ،بە زمانیان قورئان دەخوێنن و لە چەلٌمەیان[1] تێپەڕ نابێت ،لە چاكترین قسەی خەلٌكی قسە**

---

[1] **تراقی : واتە بینە قاقا ـ بەو بەشەی گەروو دەوترێت كە لە نێو قوڕگ و لای سەروی سنگیدایە .**

**دەکەن ،لە ئاین دەردەچن لە چەشنی دەرچوونی تیر لە کەوان ،هەرکەس ئەوانی بینی با بیانکوژێت ،چونکە بکوژیان پاداشتێکی گەورەی دەست دەکەوێت لەلای خوای گەورە .**

( السنة ٩١٤ )

٧٧٥٤- يخرج فيكم قوم تحقرون صلاتكم مع صلاتهم و صيامكم مع صيامهم و عملكم مع عملهم يقرءون القرآن لا يجاوز حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية ينظر الرامي في النصل فلا يرى شيئا و ينظر في القدح فلا يرى شيئا و ينظر في الريش فلا يرى شيئا و يتمارى في الفوق هل علق به من الدم شيء.

( صحيح ) ( ق هـ ) عن أبي سعيد.

**٧٧٥٤- کەسانێکتان تیا لەناودا پەیدا دەبن ،نوێژو ڕۆژو و ،کردەوەی خۆتانتان لە بەرچاو دەکەوێت لەبەرامبەر نوێژو ڕۆژو کردەوەی ئەوان ،قورئان دەخوێنن و لە قورگیان تێناپەڕێت ،لە ئایین دەردەچن وەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت ،تیر هاوێژ تەماشای نووکی تیرەکەدەکات و هیچ نابینێ ،تەماشای دارەکەشی دەکات و هیچ نابینێ، تەماشای پەڕەکەی دەکات و هیچ نابینێ ،ئینجا تەماشای جێگای تیرەکە دەکات لە پەتەکەی ئایا هیچ خوێنی پێوەیە .**

( السنة ٩٢٣ )

٧٧٥٥- يخرج قوم في آخر الزمان يقرءون القرآن لا يجاوز تراقيهم سيماهم التحليق إذا لقيتموهم فاقتلوهم.

( صحيح ) ( هـ ) عن أنس.

**٧٧٥٥- کەسانێك لە کۆتایی زەمانەدا پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن و لە چەڵەمەی سنگیان تێپەڕ نابێت ،نیشانەیان ڕیش تاشینە ،ئەگەر ئەوانەتان بینین بیانکوژن .**

( السنة ٩٤٠ )

٧٧٥٦- يخرج قوم من أمتي يقرءون القرآن ليس قراءتكم إلى قراءتهم بشيء و لا صلاتكم إلى صلاتهم بشيء و لا صيامكم إلى صيامهم بشيء يقرءون القرآن يحسبون أنه لهم و هو عليهم لا تجاوز صلاتهم تراقيهم يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية لو يعلم الجيش الذين يصيبونهم ما قضى لهم على لسان نبيهم لاتكلوا عن العمل و آية ذلك أن فيهم رجلا له عضد ليس فيه ذراع على رأس عضده مثل حلمة الثدي عليه شعرات بيض.

( صحيح ) ( م د ) عن علي.

**٧٧٥٦- کەسانێك لە ئوممەتەکەم پەیدا دەبن ،قورئان دەخوێنن ،قورئان خوێندن و نوێژو ڕۆژووی ئێوە هچ نیە لە چاو قورئان خوێندن و نوێژو ڕۆژووی ئەوان ،قورئان دەخوێنن وادەزانن لە بەرژەوەندییاندایە بەلأم لە دژیانە ،نوێژەکانیان لە ( بینە قاقا ) چەڵمەیان تێپەڕ نابێت ، لە ئیسلام دەردەچن ،وەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت ،ئەگەر ئەو سوپایەی دەست لە ئەوان دەوەشێنن بیانزانیایە لە سەر زاری پێغەمبەرەکەیان چییان بۆ بڕاوەتەوە ،وازیان لە کردەوە دەهێنا ،نیشانەکەشیان ئەوەیە پیاوێکیان تیایە بازووی هەیە ،قۆڵی نییە ،لەسەر بازووی نیشانەیەکی وەکو گۆی مەمکی پێوەیە و هەندێ مووی سپی لەسەرە .**

( السنة ٩١٢ )

٧٧٥٧- يخرج من المشرق أقوام محلقة رءوسهم يقرءون القرآن بألسنتهم لا يعدو تراقيهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية.

( صحيح ) ( حم ق ) عن سهل بن حنيف.

**٧٧٥٧- کەسانێك لە ڕۆژهەلأتەوە پەیدا دەبن سەریان تاشراوە ،قورئان دەخوێنن بە زمانیان و لە ( بینە قاقا ) چەڵەمەی سنگیان تێپەڕ نابێت ، لە ئایین دەردەچن ،وەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت.**

( السنة ٩٠٨ )

٧٧٥٨- يخرج ناس من قبل المشرق يقرءون القرآن لا يجاوز تراقيهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية ثم لا يعودون فيه حتى يعود السهم إلى فوقه سيماهم التحليق.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي سعيد.

**٧٧٥٨- کەسانێك لە لایەن ڕۆژهەلأتەوە پەیدا دەبن ،قورئان دەخوێنن لە چەڵەمەیان تێپەڕنابێت ، لە ئایین دەردەچن ،وەکو دەرچوونی تیر لە کەوان ،ئینجا ناشگەڕێتەوە بۆ سەر دینیش تاکو تیرەکە نەگەڕێتەوە شوێنی خۆی ، سەرو سیمایان ڕیش تاشینە .**

( السنة ٩٢٣ )

٧٧٥٩- يخرب الكعبة ذو السويقتين من الحبشة.

( صحيح ) ( ق ن ) عن أبي هريرة.

**٧٧٥٩-** ( ذو السويقتين[1] ) **له حەبەشەيەو كەعبەش وێران دەكات[2].**

( الصحيحة ٧٧٢ )

٧٧٦٠- يعوذ عائذ بالبيت فيبعث إليه بعث فإذا كانوا ببيداء من الأرض خسف بهم قيل: يا رسول الله ! فكيف بمن كان كارها ؟ قال: يخسف به معهم و لكنه يبعث يوم القيامة على نيته.

( صحيح ) ( حم م ) عن أم سلمة.

**٧٧٦٠- پەنا بەرێك پەنا بۆ كەعبە دەبات ،ئيتر نێردەيەكى بۆ ڕەوانە دەكرێت ،جا كە دەگەنە دەشتاييەك خواى گەورە بە ناخى زەوييباندا دەباتە خوار ،وتيان : ئەى پێغەمبەرى خوا ! دەبىٚ حاڵى ئەو كەسە چۆن بێت كە بە زۆر دەبرێت ؟ فەرمووى : هەموويان ڕۆدەچن و لە ڕۆژى قيامەتدا لەسەر نيەتەكانيان زيندوو دەكرێنەوە .**

( الصحيحة ١٩٢٤ )

٧٧٦١- يغزو جيش الكعبة فإذا كانوا ببيداء من الأرض خسف بأولهم و آخرهم ثم يبعثون على نياتهم.

( صحيح ) ( خ ) عن عائشة.

**٧٧٦١- سوپايەك هێرش دەكاتە سەر كەعبە ،كاتێك دەگەنە زەويەكى پانتايى تەخت ، سەرەتاو كۆتاييان ڕۆدەچن بە ناخى زەويدا ، دوايى لەسەر نيازى دڵيان زيندو دەكرێنەوە .**

( الصحيحة ١٦٢٢ )

٧٧٦٢- يغزو هذا البيت جيش فيخسف بهم بالبيداء.

( صحيح ) ( ن ) عن أبي هريرة.

**٧٧٦٢- ئەمماڵەى خوا سوپايەك غەزاى دەكات كە دەبرێنە ناخى زەويدا لەبەريدا .**

( الصحيحة ٢٤٣٢ )

٧٧٦٣- يوشك الفرات أن يحسر عن جبل من ذهب فإذا سمع به الناس ساروا إليه فيقول من عنده: و الله لئن تركنا الناس يأخذون منه ليذهبن به كله فيقتتلون عليه حتى يقتل من كل مائة تسعة و تسعون.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي

---

[1] **( ذو السويقتين ) واتە ئەو پياوە حەبەشيەى (( قوڵى كورتە )) واتە قاچى لە خوار ئەژنۆيەتى وە كورت و خڕپنە .**

[2] **جياوازييەكى زۆر هەيە لە نێوان زاناياندا سەبارەت بە كاتى ڕووخاندانى كەعبە ،واشدەردەكەوێت ئەوە لە پاش تەواوبوونى هەموو نيشانەكانى قيامەت ڕوودەدات ،خواى گەورەيش دەفەرموێت : ( أولم نمكن لهم حرما امنا )بۆيە تا ئايين مابێت كەعبەيش هەردەمێنێت والله اعلم ( وەرگێڕ )**

**٧٧٦٣- نزیکە فورات ئاوەکەی کەم بێتەوە و کێوێکی ئاڵتوون دەرکەوێت ،کاتێك خەڵکی ئەوە دەبیستن بەرێ دەکەون بەرەو لای ،ئەوانەی لەوێن دەڵێن : ئەگەر واز لە خەڵکی بهێنن لەو ئاڵتوونە ببەن هەمووی دەبەن و ،کوشتارێك لەسەری دروست دەبێت ،تەنانەت لە هەموو سەد کەسێك نەوەدو نۆیان دەکوژرێن .**

( المشكاة ٥٤٤٣ )

٧٧٦٤- يوشك الفرات أن يحسر عن كنز من ذهب فمن حضره فلا يأخذ منه شيئا.

( صحيح ) ( ق د ) عن أبي هريرة.

**٧٧٦٤- خەریکە فورات ئاوەکەی کەم بێتەوە لەسەر گەنجینەیەکی ئاڵتوون جا هەرکەس ئامادەی بوو با هیچی لێ هەڵنەگرێت .**

( المشكاة ٥٤٤٢ )

٧٧٦٥- يوشك المسلمون أن يحاصروا إلى المدينة حتى يكون أبعد مسالحهم سلاح.

( صحيح ) ( د ك ) عن ابن عمر.

**٧٧٦٥- زۆری نەماوە موسڵمانان گەمارۆ بدرێن بەرەو مەدینە ،تاکو ناوچەی ( سلاح ) دەبێتە دوورترین قەڵاو سنوری خۆ حەشاردانیان .**

( المشكاة ٥٤٢٧ )

٧٧٦٦- يوشك أن تداعى عليكم الأمم من كل أفق كما تداعى الأكلة إلى قصعتها قيل: يا رسول الله ! فمن قلة يومئذ ؟ قال: لا و لكنكم غثاء كغثاء السيل يجعل الوهن في قلوبكم و ينزع الرعب من قلوب عدوكم لحبكم الدنيا و كراهيتكم الموت.

( صحيح ) ( حم د ) عن ثوبان.

**٧٧٦٦- خەریکە ئوممەتەکەنتان لە هەموو لایەکەوە بەسەرتاندا دابارن ،هەروەکو کەسانی برسی دادەبارنە سەر سفرەو خوان ،وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەبەر کەمیمانە لەو ڕۆژەدا ؟ فەرمووی : نەخێر بەڵام کەفن وەکو کەفی لافاون ،دڵەکانتان لاواز دەبن ،،ترسیش لە دڵی دوژمنەکاتاندا دادەڕندرێت ،چونکە ئێوە دونیاتان خۆش دەوێت و ،ڕقتان لە مردنە .**

( الصحيحة ٩٥٦ )

٧٧٦٧- يوشك إن طالت بك مدة أن ترى قوما في أيديهم مثل أذناب البقر يغدون في غضب الله و يروحون في سخط الله.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٧٦٧- دوور نییە ئەگەر تەمەنت درێژ بێت کەسانێك ببینی شتێکیان بەدەستەوەیە وەکو کلکی مانگا وایە ،بەیانی و ئێوارە لە ڕق و قینی خوای گەورەدا دێن و دەچن .**

( الصحيحة ١٨٩٣ )

٧٧٦٨- يوشك أن يأتي زمان يغربل فيه الناس غربلة و تبقى حثالة من الناس قد مرجت عهودهم و أماناتهم و اختلفوا فكانوا هكذا - و شبك بين أصابعه - قالوا: كيف بنا يا رسول الله ؟ قال: تأخذون ما تعرفون و تدعون ما تنكرون و تقبلون على أمر خاصتكم و تذرون أمر عامتكم.

( صحيح ) ( حم د ك ) عن ابن عمر.

**٧٧٦٨- دوورنیە سەردەمێك بێت خەڵکی بە بێژران ببێژرێن ،ئینجا هەندێك هەرچی و پەرچی بمێننەوە بێ پەیمان و ناپاك ،لەنێو خۆیاندا ناکۆکیش دەبن بەم شێوەیە ، پەنجەکانی کرد بە یەکدا – وتیان : ئێمە چی بکەین ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : ئەوە وەردەگرن کە دەیزانن ،وە واز لەوە دەهێنن کە نکوڵی لێ دەکەن ،خەریکی خۆتان دەبن و واز لە کارو باری گشتی دەهێنن .**

( الصحيحة ٢٠٥ )

٧٧٦٩- أتاني جبريل فأخبرني أن أمتي ستقتل ابني هذا - يعني الحسين - و أتاني بتربة من تربة حمراء.

( صحيح ) ( ك ) عن أم الفضل بنت الحارث .

**٧٧٦٩- جبریل هاتە لام و ،پێی وتم ئوممەتەکەم ئەم کوڕەم– واتە حوسەین – دەکوژن، هەندێ خۆڵی سووری ئەو خاکەی بۆ هێنام .**

( الصحيحة ٨١٩ )

٧٧٧٠- أتدرون أين تذهب هذه الشمس ؟ إن هذه تجري حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش فتخر ساجدة فلا تزال كذلك حتى يقال لها: ارتفعي ارجعي من حيث جئت فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ثم تجري حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش فتخر ساجدة فلا تزال كذلك حتى يقال لها: ارتفعي ارجعي من حيث جئت فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ثم تجري لا يستنكر

الناس منها شيئا حتى تنتهي إلى مستقرها ذاك تحت العرش فيقال لها: ارتفعي أصبحي طالعة من مغربك فتصبح طالعة من مغربها أتدرون متى ذاكم ؟ حين ( لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا .

( صحيح ) ( م ) عن أبي ذر .

**٧٧٧٠- ئايا دەزانن ئەو خۆرە بۆ كوێ دەچێت ؟ دەڕوات تاكو دەگاتە بارەگاى خۆى ،لەژێر عەرشداو كڕنووش دەبات ،هەروا دەمێنێتەوە تاكو پێى دەوترێت : بەرز بەرەوە ، بگەڕێرەوە بۆ ئەو جێگايەى كە لێوەى هاتى ،ئەويش دەگەڕێتەوە ،هەروا دەمێنێتەوە بە هەڵهاتووى دەڕوات تا دەگاتەوە جێگاى خۆى لەژێر عەرشداو كڕنووش دەبات ،ئيتر هەروا دەمێنێتەوە تا كو پێى دەوترێت ، : بەرز بەرەوە بگەڕێرەوە بۆ ئەو جێگايەى لێى هاتى ،ئەويش دەگەڕێتەوە و ،لە جێگاى دەرچوونى خۆيەوە هەڵدێت و ،ئينجا دەڕوات كەس نكۆڵى هيچى لىٚ ناكات ،تاكو دەگاتە جێگاى خۆى لە ژێر عەرشداو ، پىٚ دەوترێت بەرز ببەرەوە ،سبەى لە ڕۆژئاواوە هەڵبىٚ ،ئەويش لە ڕۆژئاواوە هەڵدێت ،ئايا دەزانن كەى ئەوە ڕوودەدات ؟ لەو كاتەى ( لاينفع نفسا ايمانها لم تكم امنت من قبل او كسبت فى أيمانها خيرا ) { الانعام : ١٥٨ }**[1]

٧٧٧١- أتزعمون أني من آخركم وفاة ؟ ألا و إني من أولكم وفاة و تتبعوني أفنادا يقتل بعضكم بعضا .

( صحيح ) ( حم ) عن واثلة .

**٧٧٧١- ئايا وا دەزانن من لە دواى هەمووتان دەمرم ؟ من لە پێش هەمووتانەوە دەمرم ، ئێوەش لە دواى من تيا دەچن بە يەكتر كوشتن .**

( الصحيحة ٨٤٩ )

٧٧٧٢- أخبرني جبريل أن حسينا يقتل بشاطئ الفرات.

( صحيح ) ( ابن سعد ) عن علي .

**٧٧٧٢- جبريل پێى وتم : حوسەين لە ڕۆخى فورات دەكوژرێت**[2] .

( الصحيحة ٧٤٤ )

---

[1] **واتە : تازە بڕوا هێنانى هيچ كەس سودى پىٚ ناگەيەنێت ئەگەر لەوەو پێش بڕواى نەهێنابێت يان بە بڕواكەى خێرو چاكەى نەكردبێت .**

[2] **قورتوبى دەڵێت: ئەوەى باس دەكرێت لەعەسقەلانە يان لە قاهيرەيە هەواڵێكى پووچەڵەو ڕاست نييە.**

٧٧٧٣- إذا بلغ بنوا أبي العاص ثلاثين رجلا اتخذوا عباد الله خولا و مال الله دولا و كتاب الله دغلا.

( صحيح ) ( حم ع ك ) عن أبي سعيد ( ك ) عن أبي ذر .

**٧٧٧٣- ئەگەر نەوەی ( ابو العاص ) بگەنە سی کەس ،بەندەکانی خوا دەکەنە کۆیلەو خزمەتکاری خۆیان و ،ماڵ و سامانی خوا بە ئارەزووی خۆیان دابەش[1] دەکەن و ،بە قورئانیش دەکەنە هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی .**

( الصحيحة ٧٤٤ )

٧٧٧٤- إذا هلك كسرى فلا كسرى بعده و إذا هلك قيصر فلا قيصر بعده و الذي نفسي بيده لتنفقن كنوزهما في سبيل الله.

( صحيح ) ( حم ق ) عن جابر بن سمرة ( حم ق ت ) عن أبي هريرة .

**٧٧٧٤- ئەگەر کیسرا بە هیلاك بچێت ئیتر کیسرا لە دوای ئەو دروست نابێتەوە ،ئەگەر قەیصەریش لەناو بچێت ئیتر قەیصەر دروست نابێتەوە سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەنجینەکانیان لە پێناو خوا دەبەخشن.**

( صحيحة الترمذي ٢٢١٦ )

٧٧٧٥- افترقت اليهود على إحدى و سبعين فرقة فواحدة في الجنة و سبعون في النار و افترقت النصارى على اثنتين و سبعين فرقة فإحدى و سبعون في النار و واحدة في الجنة و الذي نفس محمد بيده لتفترقن أمتي على ثلاث و سبعين فرقة فواحدة في الجنة و اثنتان و سبعون في النار.

( صحيح ) ( هـ ) عن عوف بن مالك .

**٧٧٧٥- جوولەکە پەرتەوازە بوون بە حەفتاو یەك پارچە،یەکێکیان لە بە هشتەو ،حەفتایان لە دۆزەخدایە ،گاورەکانیش دابەشبوون بە حەفتاو دوو پارچە ،حەفتاو یەکیان لە دۆزەخدایەو یەکێکیان لە بەهەشتدایە ،سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئوممەتی من دەبنە حەفتاو سێ پارچە ،یەك کۆمەڵیان لە بەهەشتدان و حەفتاو دوو پارچەیان لە دۆزەخدان .**

( الصحيحة ١٤٩٢ )

٧٧٧٦- افترقت اليهود على إحدى و سبعين فرقة و تفرقت النصارى على اثنتين و سبعين فرقة و تفرقت أمتي على ثلاث و سبعين فرقة.

( صحيح ) ( ٤ ) عن أبي هريرة .

---

[1] **واتە : ئەیدەنە هەندێ کەس و دارودەستەی خۆیان کەسانی تری لێ بێبەش دەکەن .**

**٧٧٧٦- جوولەکە بوونە حەفتاو یەك بەشەوە و ،گاورەکان بوونە حەفتاو دوو بەشەوە ، ئوممەتی منیش دەبێتە حەفتاو سێ بەشەوە .**

( الصحيحة ٢٠٣)

٧٧٧٧- الزم بيتك.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عمر .

**٧٧٧٧- وابەستەی ماڵی خۆت بە** [١].

( الصحيحة ١٥٣٥ )

٧٧٧٨- أما إنها ستكون لكم الأنماط.

( صحيح ) ( ق د ت ) عن جابر .

**٧٧٧٨- بەڵێ رۆژێك دێت دەبنە خاوەنی** ( انماط [٢] ).

( الصحيحة ٤٠٠٦ )

٧٧٧٩- إن الإسلام بدأ غريبا و سيعود غريبا كما بدأ فطوبى للغرباء.

( صحيح ) ( م هـ ) عن أبي هريرة ( ت هـ ) عن ابن مسعود ( هـ ) عن أنس ( طب ) عن سلمان وسهل بن سعد وابن عباس .

**٧٧٧٩- ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکردو جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە ،جا خۆش بەختی بۆ نامۆکان .**

( الصحيحة ١٢٧٣ )

٧٧٨٠- إن الإسلام بدأ غريبا و سيعود غريبا كما بدأ و هو يأرز بين المسجدين كما تأرز الحية في جحرها.

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمر .

**٧٧٨٠- ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکردو، جارێکی تریش غەریب دەبێتەو، وەکو یەکەم جار ،کۆیش دەبێتەوە لە نێوان هەردوو مزگەوتەکەدا** [٣] **،وەکو چۆن مار لەناو کونەکەیدا خۆی کۆدەکاتەوە.**

( الصحيحة ١٢٧٣ )

---

١ لەسەردەمی ئاژاوەو خراپی رۆژگار.

٢ جۆرێکە لە راخەر

٣ واتە : نێوان مەککەو مەدینە ( وەرگێڕ )

٧٧٨١- إن بعدي من أمتي قوما يقرءون القرآن لا يجاوز حلاقمهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية ثم لا يعودون إليه شر الخلق و الخليقة.

( صحيح ) ( حم م هـ ) عن أبي ذر ورافع بن عمرو الغفاري معا .

**٧٧٨١- لە پاش خۆم کەسانێك قورئان دەخوێنن لە قورگیان تێناپەڕێت ،لە ئیسلام دەردەچن وەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت ،ئینجا بۆشی ناگەڕێنەوە ، ئەوان خراپترینی خەڵکن .**

( الصحيحة ٢٠٠٥ )

٧٧٨٢- إن بني إسرائيل افترقت على إحدى و سبعين فرقة و إن أمتي ستفترق على اثنتين و سبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة و هي: الجماعة.

( صحيح ) ( هـ ) عن أنس .

**٧٧٨٢- ئەوەی ئیسرائیل بوونە حەفتاو یەك بەش ،ئوممەتی منیشی پەرتەوازەن و دەبنە حەفتاو دوو بەش ،هەموویان لە ئاگردان تەنها یەکێکیان نەبێت ،ئەویش کۆمەڵی موسڵمانانە [1] .**

( الصحيحة ٢٠٣ )

٧٧٨٣- إن في أمتي خسفا و مسخا و قذفا.

( صحيح ) ( طب ) عن سعيد بن أبي راشد .

**٧٧٨٣- بەڕاستی لە ئوممەتی مندا ڕۆچوون و شێواندن و بەردباران ڕوودەدات .**

( الروض النضير ٢/٣٩٣ )

٧٧٨٤- إن في ثقيف كذابا و مبيرا.

( صحيح ) ( حم م ) عن أسماء بنت أبي بكر .

**٧٧٨٤- لە نێو هۆزی ( ثقيف ) دا درۆزنێك [2] و لە ناو بەرێك [3] هەیە .**

( المشكاة ٥٩٨٤ )

---

**[1] هەموو ئەو فەرموودەی باس لەو کۆمەڵانەدەکات واتە ( حديث الفرق ) لە بوخاری و موسلیم دا نەهاتووە ، سەبارەت بە واتاکەشی جیاوازی هەیە لە نێوان زانایاندا و ،،سەبارەت بە سەنەدکەی زۆر لە زانایان بە لاوازیان زانییوە وەکو ( ابن حزم )و ( ابن الوزير ) و ( القرضاوی )،بۆیە ، پێم باشە کەسی بە توانا وردبێتەوە و ،بڕوانێتە سەر چاوەکان لەو بارەوە . ( وەرگێڕ )**

**[2] ( المختار الثقفی )یە .**

**[3] ( الحجاج بن يوسف الثقفي )یە**

٧٧٨٥- إن من ضئضئ هذا قوما يقرءون القرآن لا يجاوز حناجرهم يقتلون أهل الإسلام و يدعون أهل الأوثان يمرقون من الإسلام كما يمرق السهم من الرمية لئن أدركتهم لأقتلنهم قتل عاد.

( صحيح ) ( ق د ن ) عن أبي سعيد .

**٧٧٨٥- لەوەچەی ئەمە كەسانێك دێن قورئان دەخوێنن لە قورگیان تێپەڕنابێت ، موسڵمانان دەكوژن و واز لە بت پەرستان دەهێنن ، لە ئیسلام دەردەچن ،وەكو دەرچوّن تیر لە كەوانەكەی دەردەچێت ،ئەگەر فریایان بكەوم وەكو گەلی عاد دەیانكوژم .**

( ألارواء ٨٥٦ )

٧٧٨٦- إن من قبل مغرب الشمس بابا مفتوحا عرضه سبعون سنة فلا يزال ذلك الباب مفتوحا حتى تطلع الشمس نحوه فإذا طلعت من نحوه لم ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا.

( صحيح ) ( هـ ) عن صفوان بن عسال .

**٧٧٨٦- لەلایەن خۆرئاواوە دەرگایەكی كراوە هەیە پانیەكەی حەفتا ساڵە ، بەردەوام ئەو دەرگایە هەر كراوەیە تا ئەو كاتەی خۆر لەو جێگایەوە هەڵدێت ،جا ئەگەر لە وێوە خۆر هەڵهات هیچ كەسێك ئیمانەكەی بەكەڵكی نایەت ،ئەگەر پێشتر بڕوایی نەهێنابێت، یان چاكەیەكی بەدەست نەهێنابێت لە ئیمانەكەیدا .**

( صحيح ابن ماجة ٤٠٧٠ )

٧٧٨٧- إن من ورائكم أياما ينزل فيها الجهل و يرفع فيها العلم و يكثر فيها الهرج: القتل

( صحيح ) ( ت هـ ) عن أبي موسى .

**٧٧٨٧- ڕۆژانێك لە دوای ئێوە دێت نەفامی تیا پەیدا دەبێت و ،زانستی تیا بەرز دەكرێتەوە ،كوشت و بڕی تیا زۆر دەبێت .**

( صحيحة الترمذى ٢٢٠٠ )

٧٧٨٨- إن من ورائكم زمان صبر للمتمسك فيه أجر خمسين شهيدا منكم.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن مسعود .

**٧٧٨٨- بەڕاستی لە دوای ئێوە سەردەمێك دێت سەردەمی ئارامگرتنە ،ئەو كەسەی وابەستەی ئایین بێت پاداشتی پەنجا شەهیدی ئێوەی هەیە.**

( الصحيحة ٤٩٤ )

٧٧٨٩- إن ناسا من أمتي سيماهم التحليق يقرءون القرآن لا يجاوز حلوقهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية هم شر الخلق و الخليقة.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة .

**٧٧٨٩- خەڵكانێك لە ئوممەتم نیشانەیان سەرتاشینە ،قورئان دەخوێنن و لە قورگیان تێپەڕ نابێت ، لە ئیسلام دەردەچن ،وەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت ،ئەوانە خراپترین خەڵك و دروستکراون .**

( المشكاة ٣٥٥٣ )

٧٧٩٠- إنه ستكون فرقة و اختلاف فإذا كان كذلك فاكسر سيفك و اتخذ سيفا من خشب و اقعد في بيتك حتى تأتيك يد خاطئة أو منية قاضية.

( صحيح ) ( حم ت ) عن أهبان بن صيفي .

**٧٧٩٠- لە داهاتوودا ناکۆکی و جیاوازی دروست دەبێت ،جا هەرکاتێك ئەوە ڕوویدا شمشێرەکەت بشکێنە و شمشێرێکی دار هەڵگرەو ،لە ماڵی خۆت دانیشە تاکو دەستێکی ستەمکارت بۆدێت ،یان مەرگێکی لەناوبەرت بۆ دێت .**

( الصحيحة ١٣٨٠ )

٧٧٩١- إنه يخرج من ضئضئ هذا قوم يتلون كتاب الله رطبا لا يجاوز حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية لئن أدركتهم لأقتلنهم قتل ثمود.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي سعيد .

**٧٧٩١- بەڕاستی لەوەچەی ئەو گەلە ،خەڵكانێك دێنە دونیاوە قورئان دەخوێنن و لە قورگیان تێنا پەڕێت ، لە ئایین دەردەچن ،وەکو چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت ، ئەگەر فریایان بکەوم وەکو ( ثمود ) دەیانکوژم.**

( المشكاة ٥٨٩٤ )

٧٧٩٢- أول من يبدل سنتي رجل من بني أمية.

( صحيح ) ( ع ) عن أبي ذر .

**٧٧٩٢- یەکەمین کەس سوننەتی من دەگۆڕێت پیاوێکە لە بەنی ئوممەییە .**

( الصحيحة ١٧٨٩ )

٧٧٩٣- تبلغ المساكن إهاب.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة .

**٧٧٩٣- ماڵەکانی مەدینە دەگەنە ناوچەی ( أهاب )[1].**

( المشكاة ٥٤٤٠ )

٧٧٩٤- تتركون المدينة على خير ما كانت لا يغشاها إلا العوافي و آخر من يحشر راعيان من مزينة يريدان المدينة ينعقان بغنمهما فيجدانها وحوشا حتى إذا بلغا ثنية الوداع خرا على وجوههما.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٧٧٩٤- مەدینە بەجێ دەهێڵن لەسەر چاکترین حاڵ ،کەس ناچێتە ناوی پەلەوەرو دڕندەنەبێت ،دواترین کەسیش کە حەشر دەکرێن دوو شوانن لە موزەینە ،دەیانەوێت بچنە مەدینە بە مەڕەکانیانەوە ،ئیتر دەبینن پەلەوەر و دڕندەی لێیە ،تاکو دەگەنە ( ثنية الوداع )و بە ڕوودا دەکەون .**

( الصحيحة ٦٨٣ )

٧٧٩٥- تدور رحى الإسلام لخمس و ثلاثين أو ست و ثلاثين أو سبع و ثلاثين فإن يهلكوا فسبيل من هلك و إن يقم لهم دينهم يقم لهم سبعين عاما بما مضى.

( صحيح ) ( حم د ك ) عن ابن مسعود .

**٧٧٩٥- بەرداشی ئیسلام سی و پێنج ساڵ ،یان سی و شەش ساڵ ،تانسی و حەوت ساڵ دەگەڕێت ،ئەگەر لە نێو بچن ئەوە ڕێگای لە ناوچوونە ،ئەگەریش ئایینەکەشیان بۆ پیادەبکرێت بۆ ماوەی حەفتا ساڵ بۆیان پیادە دەکرێت.**[2]

( الصحيحة ٦٨٣ )

٧٧٩٦- تذهبون الخير فالخير حتى لا يبقى منكم إلا مثل هذه.

( صحيح ) ( تخ طب ك ) عن رويفع بن ثابت .

**٧٧٩٦- پیاو چاکانتان یەك بەدوای یەکدا دەڕۆن ،تاوای لێدێت تەنها خەڵکی وەکو ئەوە خراپ و هەرچی و پەرچی نەبێت نامێنن .**

( الصحيحة ١٧٨١ )

---

**١ جێگایەکە لە دەورو بەری مەدینەیە.**

**٢ دانەری ( عون المعبود ) دەڵێت : ئەوە بزانە کە زانایان جیاوازیان هەیە دەربارەی واتای سوڕانەوەی بەرداشی ئیسلام ،زۆربەیان دەڵێن : مەبەست لە بەردەوام بوونی ئیسلامە بەچاکی و بە ڕێکو پێکی ،هەندێکیشیان دەڵێن مەبەست لە شەڕە ئەمەیش وتەی ( الخطابی ) و ( البغوی )یە.**

٧٧٩٧- تفاتلون اليهود فتسلطون عليهم حتى يختبىء أحدهم وراء الحجر ، فيقول الحجر: يا عبد الله هذا يهودي ورائي فاقتله.

(صحيح) (ق ت) عن ابن عمر.

**٧٧٩٧- جەنگ دەكەن لەگەڵ جوولەكەو زاڵ دەبن بەسەریاندا ،تەنانەت لە دوای بەردەوە خۆیان حەشاردەدەن و ،بەردەكە دەڵێت : ئەی بەندەی خوا ئەوە جوولەكەیەكە لە پشتمەوە بیكوژە .**

( صحيحة الترمذی ٢٢٣٦ )

٧٧٩٨- سألت ربي ثلاثا فأعطاني اثنتين و منعني واحدة سألت ربي أن لا يهلك أمتي بالسنة فأعطانيها و سألته أن لا يهلك أمتي بالغرق فأعطانيها و سألته أن لا يجعل بأسهم بينهم فمنعنيها.

( صحيح ) ( حم م ) عن سعد.

**داوای سێ شتم كرد لە پەروەردگارم ،دووانی پێ بەخشیم و یەكێكی لێ قەدەغە كردم ، داوام كرد لە پەروەردگارم كرد ئوممەتم بە گرانی لەناو نەبات ئەوەی پێبەخشیم ، داواشم لێ كرد ئوممەتم بە ڕۆچوون بەئاودا لەناو نەبات و ئەوەشی پێبەخشیم ،داواشم لێ كرد جەنگیان نەخاتە نێوان خۆیانەوە بەلآم ئەوەی لێ قەدەغەكردم .**

( الصحيحة ١٧٢٤ )

٧٧٩٩- سيخرج أقوام من أمتي يشربون القرآن كشربهم اللبن

( صحيح ) ( طب ) عن عقبة بن عامر

**٧٧٩٩- لەمەودوا كەسانێك لە ئوممەتم پەیدا دەبن قورئان دەخۆنەوە وەكو چۆن بۆ شیر دەخۆنەوە[1].**

( الصحيحة ١٨٨٧ )

٧٨٠٠- طائفة من أمتي يخسف بهم يبعثون إلى رجل فيأتي مكة فيمنعه الله تعالى و يخسف بهم مصرعهم واحد و مصادرهم شتى إن منهم من يكره فيجيء مكرها .

( صحيح ) ( طب ) عن أم سلمة.

---

**[1] واتە : هەر بە زمانیان دەیخوێننەوەو بە بێ تێگەیشتن لە واتاكانی ،یان ورد بوونەوە لە حوكمەكانی ،بەڵكو بەسەر زمانیاندا ڕەتی دەكەن وەكو چۆن شیر بە پەلە دەخورێتەوە .**

**٧٨٠٠- كۆمەڵێك لە ئومەتەكەم بە ناخی زەویدا ڕۆ دەبرێت ،ڕەوانەی لای پیاوێك دەكرێت كە دەیەوێت بچێتە مەككەو خوای گەورەش ئەوەی لێ قەدەغە دەكات و ،بەناخی زەوییاندا دەباتە خوار ،لەیەك جێگادا تیادەچن و سەرچاوەكانی هاتنیان جیاوازە ، كەسانێكیان تیایە بە زۆر دەبرێن .**

( الصحيحة ١٩٢٤ )

٧٨٠١- كأني أنظر إليه أسود أفحج ينقضها حجرا حجرا - يعني الكعبة -.

( صحيح ) ( حم خ ) عن ابن عباس.

**٧٨٠١- دەڵێی سەیری دەكەم ڕەشێكی قۆڕپیتانە[1] بەرد بەرد دەیڕوخێنێ واتە : كەعبە دەڕوخێنێ .**

( الصحيحة ٣٧٣٤ )

٧٨٠٢- كيف أنتم إذا لم تجتبوا دينارا و لا درهما ؟ تنتهك ذمة الله و ذمة رسوله يشد الله قلوب أهل الذمة فيمنعون ما في أيديهم

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة

**٧٨٠٢- چۆن دەبێت ئێوە نە دینارو نە درهەمتان دەست نەكەوێت ؟پەیمانی خواو پێغەمبەر سوكایەتی پێبكرێت ،خوای گەورە دڵی ئەهلی زیممە توند كات و ، سەرانەكەیان نەدەن .**

( الصحيحة ٣٠٧٢ )

٧٨٠٣- كيف أنتم إذا نزل ابن مريم فيكم فأمكم ؟

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة

**٧٨٠٣- ئەبێ چۆن بن ئەگەر عیسای كوڕی مەریەم دابەزێتە ناوتان و پێش نوێژیتان بۆ بكات .**

( المشكاة ٥٥٠٦ )

٧٨٠٤- كيف أنتم إذا نزل ابن مريم فيكم و إمامكم منكم ؟

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة

**٧٨٠٤- حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر عیسای كوڕی مەریەم بێتە ناوتان و پێشەواكەشتان لەخۆتان بێت.**[2]

( المشكاة ٥٥٠٦ )

---

**[1] واتە : كەلاو كەل دەڕوات وەكو كەسی قۆڕ- پێشی قاچەكانی لێك نزیكن و دواوەو ئەژنۆو خوار ئەژنۆی لێك دورو بلاون . قاموسی ڕستە با١ ل١٩٣٢ ، والنهاية في غريب الحديث- ج٢ \ص ٣٤٥ باب : الفاء مع الحاء .**

**[2] واتە : خەلیفە لە قورەیش بێ .**

٧٨٠٥- كيف بكم إذا أتت عليكم أمراء يصلون الصلاة لغير ميقاتها ؟ صل الصلاة لميقاتها و اجعل صلاتك معهم سبحة.

( صحيح ) ( د ) عن معاذ.

**٧٨٠٥- دەبىٚ حاڵتانچۆن دەبێت ئەگەر فەرمانڕەوا گەلێكتان بێتە سەر نوێژەكانيان لە كاتى خۆياندا نەكەن ؟ نوێژ لەكاتى خۆيدا بكەو نوێژەكەت لەگەڵياندا بە سونەت دابنىٚ .**

( الصحيحة ٤٨٥ )

٧٨٠٦- كيف بكم بزمان يوشك أن يأتي يغربل الناس فيه غربلة و يبقى حثالة من الناس قد مرجت عهودهم و أماناتهم و اختلفوا و كانوا هكذا ؟ - و شبك بين أصابعه - تأخذون بما تعرفون و تدعون ما تنكرون و تقبلون على أمر خاصتكم و تذرون أمر عامتكم.

( صحيح ) ( هـ ) عن ابن عمرو.

**٧٨٠٦- دەبىٚ حاڵتان چۆن بێت لە سەردەمێكدا كە خەريكە خەڵكى لە بێژنگ بدرێن و ببێژرێنەوە وە هەندىٚ هەرچى و پەرچى و بىٚ پەيمان و ناپاك لە خەڵكى بمێننەوە و ئاواش ناكۆك بن ؟- پەنجەكانى كرد بە ناو يەكتردا – ئەوە وەرگرن كە دەيناسن و ،واز لەوە بهێنن كە بەلاتانەوە چاك نيە ،سەرقاڵى تايبەت مەندى خۆتان بن و ،واز لە كارو بارى گشتى بهێنن .**

( الصحيحة ٢٠٥ )

٧٨٠٧- لتتركن المدينة على خير ما كانت تأكلها الطير و السباع.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة.

**٧٨٠٧-مەدينە بەجىٚ دەهێڵن بەچاكترين شێوە كە لەسەرى بوو باڵندەو دڕندەكان لێى دەخۆن.**

( الضعيفة ٤٢٩٩ )

٧٨٠٨- لو لم يبق من الدنيا إلا يوم لطول الله ذلك اليوم حتى يبعث فيه رجل من أهل بيتي يواطئ اسمه اسمي و اسم أبيه اسم أبي يملأ الأرض قسطا و عدلا كما ملئت ظلما و جورا

( صحيح ) ( د ) عن ابن مسعود

**٧٨٠٨- ئەگەر لە دونيادا تەنها ڕۆژێك بمێنێت ،خواى گەورە ئەو ڕۆژە درێژ دەكاتەوە ، تاكو پياوێك لە خانەوادەى من دەنێرێت ،ناوى وەكو ناوى منەو ،ناوى باوكى وەكو ناوى باوكمە ،سەرزەوى پڕدەكاتەوە لە دادپەروەرى ،وەكو چۆن پڕكرابوو لە زۆرو ستەم.**

( الروض ٦٤٧ )

٧٨٠٩- لو لم يبق من الدهر إلايوم لبعث الله رجلا من أهل بيتي يملؤها عدلا كما ملئت جورا.

( صحيح ) ( حم د ) عن علي.

**٧٨٠٩- ئەگەر لە دونیادا تەنها ڕۆژێك مابێتەوە ، خوای گەورە لەو ڕۆژەدا پیاوێك لە خانەوادەی من دەنێرێت ، پڕی دەكات لە دادگەری وەكو چۆن پڕكرا بوو لە زۆرو ستەم .**

( الروض ٢/٥٢ )

٧٨١٠- ليؤمن هذا البيت جيش يغزونه حتى إذا كانوا ببيداء من الأرض يخسف بأوسطهم و ينادي أولهم آخرهم ثم يخسف بهم فلا يبقى إلا الشريد الذي يخبر عنهم.

( صحيح ) ( حم م ن هـ ) عن حفصة.

**٧٨١٠- كەسانێك دێن بەرەو كەعبە هێرش دەكەنە سەری ، جاكاتێك دەگەنە زەویەكی دەشتایی خوای گەورە ناوەڕاستیان دەبات بە ناخی زەویدا ، ئینجا سەرەتاكەیان بانگی كۆتاییەكەیان دەكات و ڕۆدەچن بە زەویدا ، ئیتر كەسیان نامێنێتەوە ئەو پەرتەوازەیان نەبێت كە هەواڵەكەیان دەگەیەنێت .**

( الصحيحة ١٩٢٤ )

٧٨١١- ليست السنة بأن لا تمطروا و لكن السنة أن تمطروا و تمطروا و لا تنبت الأرض شيئا.

( صحيح ) ( الشافعي حم م ) عن أبي هريرة.

**٧٨١١- گرانی ئەوە نیە كە بارانتان بۆ نەبارێ ، بەڵام گرانی ئەوەیە هەر باران ببارێت و ببارێت ، و هیچ لە زەوی سەوز نەبێت .**

( المشكاة ١٥١٥ )

٧٨١٢- لينتقضن الإسلام عروة عروة.

( صحيح ) ( حم ) عن فيروز الديلمي.

**٧٨١٢- بێگومان ئیسلام گرێ بە گرێ هەڵدەوەشێتەوە.**

( الترغيب ٥٧٢ )

٧٨١٣- ما من عام إلا و الذي بعده شر منه حتى تلقوا ربكم.

( صحيح ) ( ت ) عن أنس.

**٧٨١٣- ساڵ نییە ئەوەی دوای خۆی لەو خراپترنەبێت ، تاكو دەگەن بە پەروەردگارتان .**

( الصحيحة ١٢١٨ )

٧٨١٤- من خلفائكم خليفة يحثو المال حثيا لا يعده عدا.

( صحيح ) ( م ) عن أبي سعيد.

**٧٨١٤- لە خەلیفەكانتان خەلیفەیەك هەیە ،ماڵ دەڕێژێت و نایژمێرێت[1]**

( الصحيحة ٣٠٧٢ )

٧٨١٥- منعت العراق درهمها و قفيزها و منعت الشام مدها و دينارها و منعت مصر أردبها و دينارها وعدتم من حيث بدأتم وعدتم من حيث بدأتم وعدتم من حيث بدأتم.

( صحيح ) ( حم م د ) عن أبي هريرة.

**٧٨١٥- عێراق درهەم و قەفیزی[2] خۆی لێ قەدەغە دەكرێت شامیش ( مد ) و ( دینار ) ی خۆی لێ قەدەغەكرد ،میسریش پێوانەی ( اردب )[3] و دیناری خۆی لێ قەدەغە دەكرێت گەڕانەوە بۆ ئەو جێگەیەی دەستان پێكرد ،گەڕانەوە بۆ ئەو جێگایەی دەستان پێ كرد .[4]**

( صحيحة ابی داود ٣٠٣٥ )

٧٨١٦- هلك كسرى ثم لا يكون كسرى بعده و قيصر ليهلكن ثم لا يكون قيصر بعده و ليقسمن كنوزهما في سبيل الله.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٨١٦- كیسرا لە ناو دەچێت و لە دوای ئەویش كیسرا نایەت ،قەیصەریش لە ناو دەچێت و،لە دوای ئەویش قەیصەر نایەت ، بێگومان ئێوە گەنجینەكانیان دابەش دەكەن لە پێناو خوادا .**

( المشكاة ٥٤١٨ )

٧٨١٧- و الذي نفسي بيده ليأتين على الناس زمان لا يدري القاتل في أي شيء قتل و لا يدري المقتول في أي شيء قتل.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

---

**١ لە ڕیوایەتێكدا لەلای ( الحارث بن ابي اسامة ) هاتووە كە ئەو خەلیفەیە مەهدییە .**

**٢ دوو پێوانەی عێراقە .**

**٣ پێوانەی خەڵكی میسرە**

**٤ واتای فەرموو دەكە ئەوە دەگەیەنێت كە ڕۆمەكان دەسگرن بە سەر وڵاتی ئیسلامدا و ،ئەوانە قەدەغە دەكەن .**

**٧٨١٧- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ،سەردەمانێك دێت بەسەرخەڵکیدا بکوژ نازانێت بۆ کوشتی و ،کوژراویش نازانێت بۆ کوژرا .**

( المشكاة ٥٣٩٠ )

٧٨١٨- و الذي نفسي بيده ليوشكن أن ينزل فيكم ابن مريم حكما مقسطا و إماما عدلا فيكسر الصليب و يقتل الخنزير و يضع الجزية و يفيض المال حتى لا يقبله أحد و حتى تكون السجدة الواحدة خيرا من الدنيا و ما فيها.

( صحيح ) ( حم ق ت هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٨١٨- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ،زۆری نەماوە عیسای کوڕی مریەم دابەزێتەناوتان وەکو دادوەرێکی دادگەرو ، پێشەوایەکی دادپەروەر ،ئینجا خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و ،سەرانە لادەبات و ، پارەش ئەوەندە زۆر دەبێت کەس وەری ناگرێت ،تاکو وای لێدێت تەنها یەك سوژدەیەك لە دونیاو ،هەرچیش لە دونیادایە چاکتر دەبێت.**

( الصحيحة ٢٤٥٧ )

٧٨١٩- و الذي نفسي بيده ليهلن ابن مريم بفج الروحاء حاجا أو معتمرا أو ليثنينهما.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٧٨١٩- سوێند بەوەی گیانی می بەدەستە ، هەر دەبێت عیسای کوڕی مەریەم لە ( فج الروحاء )[1]موە ( ( لبيك اللهم لبيك ) بکات بۆ حەج ،یان بۆ عومرە ،یان یەکیان بخات.**

( الصحيحة ٢٤٥٧ )

٧٨٢٠- و الله لينزلن ابن مريم حكما عادلا فليكسرن الصليب و ليقتلن الخنزير و ليضعن الجزية و لتتركن القلاص فلا يسعى عليها و لتذهبن الشحناء و التباغض و التحاسد و ليدعون إلى المال فلا يقبله أحد.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٨٢٠- سوێند بە خوا ،عیسای کوڕی مەریەم هەر دادەبەزێت ،وەکو دادوەرێکی دادپەروەرو ،خاچ دەشکێنێت و ،بەراز دەکوژێت و ،سەرانە لادەبات و ،واز لە جوانوە وشتر دەهێنرێت و کەس هەڵپەی بۆ ناکات ،رق و کینەو رق لە یەکتر بوون و ،چاو لەماڵی یەکتر برین نامێنێت و ،بانگەوازیش دەکەن بۆ ماڵ و سامان بەلام کەس وەر ناگرێت .**

( الصحيحة ٢٤٥٧ )

---

[1] **جێگایەکە لە نێوان مککە و مەدینە .**

٧٨٢١- لا تنتهي البعوث عن غزو هذا البيت حتى يخسف بجيش منهم

( صحيح ) ( ن ك ) عن أبي هريرة

**٧٨٢١- نێردەكانى پەلاماردانى كەعبە نابڕێنەوە ،تاكو سوپايەكيان بە ناخى زەويدا بەرێنە خوار .**

( الصحيحة ٢٤٣٢ )

٧٨٢٢- لا تنتهي الناس عن غزو هذا البيت حتى يغزو جيش حتى إذا كانوا بالبيداء أو ببيداء من الأرض خسف بأولهم و آخرهم و لم ينج أوسطهم قيل: فإن كان فيهم من يكره ؟ قال: يبعثهم الله على ما في أنفسهم.

( صحيح ) ( حم ت ن هـ ) عن صفية.

**٧٨٢٢- خەڵكى واز ناهێنن لە شاڵاوبردن بۆ ئەو ماڵە ،تاكو سوپايەك غەزا شاڵاو دەبات و ،دەگەنە زەويە بەيارێكى كاكى بەكاكى ،ئەو سا سەرەتاو كۆتايى و ناوەڕاستيان ڕۆدەچن ،وتيان : ئەى ئەگەر كەسانێكيان تيادا بێت بەزۆر هێنرابێتن ؟ فەرمووى :خواى گەورە لەسەر نيەتەكانى دڵيان زيندوويان دەكاتەوە .**

( الصحيحة ٣٤٣٢ )

٧٨٢٣- لا يذهب الليل و النهار حتى تعبد اللات و العزى ثم يبعث الله ريحا طيبة فيتوفى كل من كان في قلبه مثقال حبة خردل من إيمان فيبقى من لا خير فيه فيرجعون إلى دين آبائهم.

( صحيح ) ( م ) عن عائشة.

**٧٨٢٣- شەو ڕۆژ نابڕێنەوە تاكو جارێكى تر لات و عووزا نەپەرسترێن ،ئينجا خواى گەورە بايەكى فێنك دەنێرێت هەموو كەسێك كە بە ئەندازەى گەرديلەيەك بڕوا لە دڵيدا بێت پێى دەمرێت ،ئەوانە دەمێننەوە ،كە هيچ چاكەيەكيان نيە ،ئەوانەش دەگەڕێنەوە سەر ئاينى باو باپيرانيان .**

( الصحيحة ١ )

٧٨٢٤- لا يذهب الليل و النهار حتى يملك رجل من الموالي يقال له جهجاه.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٧٨٢٤- شەو ڕۆژ بەسەر ناچن تاكو پياوێك لە مەواليیەكان نەبێتە پادشا پێى دەوترێت جەهجاهە .**

( الصحيحة ٢٤٤١ )

٧٨٢٥- لا يقتل قرشي صبرا بعد هذا اليوم إلى يوم القيامة.

( صحيح ) ( م ) عن مطيع.

**٧٨٢٥- لەمڕۆ بەدواوە هیچ قورەیشیەك بە كۆتكراوى ناكوژرێت تا ڕۆژى قیامەت .**

( الصحيحة ٢٤٢٧ )

٧٨٢٦- يا أبا ذر ! أرأيت إن أصاب الناس جوع شديد لا تستطيع أن تقوم من فراشك إلى مسجدك كيف تصنع ؟ تعفف " يا أبا ذر ؟ أرأيت إن أصاب الناس موت شديد يكون البيت فيه بالعبد - يعني القبر - كيف تصنع ؟ اصبر " يا أبا ذر: أرأيت إن قتل الناس بعضهم بعضا حتى تغرق حجارة الزيت من الدماء كيف تصنع ؟ اقعد في بيتك و أغلق عليك بابك قال: فإن لم أترك ؟ قال: فأت من كنت معه فكن فيهم قال: فآخذ سلاحي ؟ قال: إذن تشاركهم فيما هم فيه و لكن إن خشيت أن يردعك شعاع السيف فألق من طرف ردائك على وجهك كي يبوء بإثمه و إثمك و يكون من أصحاب النار.

( صحيح ) ( حم د هـ حب ك ) عن أبي ذر.

**٧٨٢٦- ئەى ( ابا ذر ) ! ئەگەر خەڵكى تووشى برسێتیەكى زۆر بوون ، كە نەتوانى لە جێگاكەتەوە هەڵسیت بەرەو مزگەوتەكەت چى دەكەیت ؟ خۆت سەنگین بگرە ،ئەى ( أبا ذر ) ؟ ئەگەر بینیت مردن بە شێوەیەك یەخەى خەڵكى گرت ، ماڵەكان كرانە گۆڕ چى دەكەیت ؟خۆ گربە ئەى ( أبا ذر ) ،ئەگەر خەڵكى دەستیان چووە خوێنى یەكتر تاكو ناوچەى ( حجارة الزيت ) نگرۆى خوێن بوو ،چى دەكەیت ؟ لە ماڵى خۆت دانیشەو دەرگاكەت لە خۆت داخە ، وتی : ئەى ئەگەر وازیان لىَ نەهێنام ؟ فەرمووى : بڕۆ بۆ لاى ئەوانەى لەگەڵیان بوویت ،لەگەڵ ئەوان بە ،وتی : چەكەكەم ببەم ؟ فەرمووى : كەواتە بەشداریان دەكەیت ؟ بەلاَم ئەگەر ترست هەبوو لە بریقەى شمشێر ڕاتچڵەكێنێت ،لكى پۆشاكەكەت بدە بەسەر خۆتدا ،با ئەو كەسە تاوانەكەت هەڵگرێت و ،ببێتە هاوڕێى دۆزەخ .**

( ألارواء ٢٥١٧ )

٧٨٢٧- يا أنس ! إن الناس يمصرون أمصارا و إن مصرا منها يقال لها البصرة أو البصيرة فإن مررت بها أو دخلتها فإياك و سباخها و كلاءها و سوقها و باب أمرائها و عليك بضواحيها فإنه يكون بها خسف و قذف و رجف و قوم يبيتون يصبحون قردة و خنازير.

( صحيح ) ( د ) عن أنس.

**٧٨٢٧- ئەی ئەنەس ! خەڵکی شار دروست دەکەن و شارێکیشیان ناوی بەصرەیە یان بوصەیرەیە ،جا ئەگەر پیایدا تێپەڕ بوویت یان چوویتە ناوی خۆت دوور بگرە لە خاکە شۆرەکەی و ( کلاء ) [1]ەکەی و بازاڕەکەی و ،دەرگای فەرمانڕەواکانی ،بەلاّم بڕۆ بۆ دەورو بەری چونکە ڕۆچوون و بەردباران و بومەلەرزەی تیا ڕوودەدات ،خەڵکانێکیش دەخەون کە هەڵدەسن ،دەبنە مەیمون و بەراز .**

( المشكاة ٥٤٣٣ )

٧٨٢٨- يأتي المسيح من قبل المشرق و همته المدينة حتى ينزل دبر أحد ثم تصرف الملائكة وجهه قبل الشام و هنالك يهلك.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٧٨٢٨- مەسیح [2] لەلایەن ڕۆژهەلاّتەوە دێت و ،پەرۆشی مەدینەیە ،تاکو لە پشت ئوحودەوە دادەبەزێت ،ئینجا فریشتەکان ڕووی وەردەگێڕن بەرەو لای شام ئیتر ،لەوێ تیا دەچێت .**

( الصحيحة ٢٤٥٧ )

٧٨٢٩- يأتي على الناس زمان الصابر فيهم على دينه كالقابض على الجمر.

( صحيح ) ( ت ) عن أنس.

**٧٨٢٩- سەردەمانێك دێت بەسەر خەڵکیدا ،کەسی خۆگر لەسەر ئایینەکەی وەکو ئەو کەسەیە پشکۆیەکی لە دەستی گرتبێت [3]**

( الصحيحة ٩٥٥ )

٧٨٣٠- يأتي على الناس زمان ما يبالي الرجل من أين أصاب المال ؟ من حلال أو حرام.

( صحيح ) ( ن ) عن أبي هريرة.

**٧٨٣٠- زەمانێك دێت بەسەر خەڵکیدا باکی نییە لەوەی ماڵ و سامان لە هەر سەرچاوەیەکەوە کۆیبکاتەوە پەیدا بکات ؟ ڕەوا بێت یان ناڕەوا .**

( صحيح النسائي ٤٤٥٤ )

---

[1] **جێگایەکە لە بەصرە.**

[2] **واتە : مەسیحی درۆزنە کە (( دەججال )) ،چوونکە بەسەر هەموو زەویدا دەڕوات ،یان لەبەر ئەوەی چاوێکی سڕاوەتەوە ،هەندێکیش بە هەڵە وتوویانە ،مەسیح ئەوەیش هیچ بنچینەیەکی نییە ڕاستی.**

[3] **واتە وەکو مەناوی دەڵێت : ئەو کەسەی ئارام دەگرێت ،لەسەر حوکمەکانی قورئان و فەرموودەکان و ،خۆراگردەبێت بەرانبەر ئەهلی بیدعەت و گومڕایی وەکو کەسێکە ئاگری بەدەستەوە گرتبێت و ،بەڵکو لەوەش سەختترە .... ئەوەیش یەکێکە لە موعجیزەکان چونکە ئەوە ڕوویداوە .**

٧٨٣١- يدرس الإسلام كما يدرس وشي الثوب حتى لا يدري ما صيام ؟ و لا صلاة و لا نسك و لا صدقة و يسرى على كتاب الله في ليلة فلا يبقى في الأرض منه آية و تبقى طوائف من الناس الشيخ الكبير و العجوز يقولون: أدركنا آباءنا على هذه الكلمة يقولون: لا إله إلا الله فنحن نقولها.

( صحيح ) ( هـ ك هب الضياء ) عن حذيفة.

**٧٨٣١- ئیسلام دەسڕێتەوە وەکو چۆن نەخش و نیگاری جل و بەرگ دەسڕێتەوە ،تەنانەت نازانرێت ، ڕۆژوو ،نوێژوو خواپەرستی و خێرکردن چیە ،صەدەقە ،شەویکیش بەسەر قورئاندا دێت ،تەنها یەك ئایەتی لەسەر زەویدا نامێنێت ،کۆمەڵە خەڵکێك دەمێنن پیرو بەتەمەن دەڵێن : ئێمە بە باو باپیرانمان گەیشتوین ئەم وشەیەیان دەوت** ( لاإله إلا الله )**و ،ئێمەش دەیلێین .**

( الصحيحة ٧٨ )

٧٨٣٢- يذهب الصالحون الأول فالأول و يبقى حفالة كحفالة الشعير أو التمر لا يباليهم الله تعالى بالة.

( صحيح ) ( حم خ ) عن مرداس الأسلمي.

**٧٨٣٢- پیاو چاکان دەڕۆن یەك لەدوای یەك ،هەندێك دەمێنن وەکو جۆو خورمای پوچەڵ، خوای گەورە هیچ سەنگ و بایەخێکیان پێ نادات .**

( الصحيحة ٢٩٩٣ )

٧٨٣٣- يسألوني عن الساعة و إنما علمها عند الله و أقسم بالله ما على الأرض من نفس منفوسة اليوم يأتي عليها مائة سنة.

( صحيح ) ( حم م ) عن جابر.

**٧٨٣٣- دەربارەی قیامەت پرسیارم لێ دەکەن ،تەنها زانستیشی لەلای خوایە ،سوێندیش دەخۆم بە خوای گەورە هیچ کەسێکی زیندو ئێستا لەسەر زەویدا نییە ،کە سەدساڵی تر لەسەر زەوی مابێتەوە .**

( المشكاة ٥٥١٠ )

٧٨٣٤- يكون في آخر الزمان الخسف و القذف و المسخ.

( صحيح ) ( هـ ) عن سهل بن سعد.

**٧٨٣٤- له كۆتـايى دونيـادا ڕۆچوون و ،بەردبـاران و شێواندن پەيـدادەبێت .**

( الروض ٢/٣٩٣ )

٧٨٣٥- يكون في آخر الزمان خليفة يقسم المال و لا يعده.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي سعيد وجابر.

**٧٨٣٥- له كۆتـاى دونيادا خەليفەيەك پەيدا دەبێت ،ماڵ دابەش دەكات و نـايژمێرێت .**

( الصحيحة ٤٠٠١ )

٧٨٣٦- يكون في آخر الزمان دجالون كذابون يأتونكم من الأحاديث بما لم تسمعوا أنتم و لا آباؤكم فإياكم و إياهم لا يضلونكم و لا يفتنونكم.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٧٨٣٦- له كۆتـايى زەمانەدا هەندێ درۆزن و جادوكەر سەرهەڵدەدەن ،قسە گەلێكتـان بۆ دەكەن نە ئێوەو نە بـاو بـاپيرانتـان نەتـان بيستووە و ،نەكەن نزيكيان بكەونەوە ،بـا گومڕاتـان نەكەن و لە خشتەتـان نەبەن .**

( المشكاة ١٥٤ )

٧٨٣٧- يكون في آخر أمتي خليفة يحثى المال حثيا و لا يعده عدا .

( صحيح ) ( حم م ) عن جابر.

**٧٨٣٧- له كۆتـايى ئوممەتمدا خەليفەيەك پەيدا دەبێت ،ماڵ و سامان دەڕێژێت و نـايژمێرێت .**

( الصحيحة ٤٠٠١ )

٧٨٣٨- يكون في أمتي خسف و مسخ و قذف.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن ابن عمر.

**٧٨٣٨- له ئوممەتـى من ڕۆچوون و ،شێواندن و ،بەردبـاران ڕوودەدات .**

( الصحيحة ١٧٨٧ )

٧٨٣٩- يكون في آخر هذه الأمة خسف و مسخ و قذف قيل: يا رسول الله ! أنهلك و فينا الصالحون ؟ قال: نعم إذا ظهر الخبث

( صحيح ) ( ت ) عن عائشة

**٧٨٣٩- لە كۆتـایی ئەم ئوممەتەدا ،ڕۆچوون و شێواندن و ،بەردباران ڕوودەدات ،وتـرا : ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا تیادەچین كە پیاو چاكانیشمان لەناودا ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەگەر پیسی و چە پەڵی سەری هەڵدا .**

( الصحيحة ٩٨٧ )

٧٨٤٠- يلي رجل من أهل بيتي يواطئ اسمه اسمي لو لم يبق من الدنيا إلا يوم لطول الله ذلك اليوم حتى يلي.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن مسعود وأبي هريرة.

**٧٨٤٠-پیاوێك لە خانەوادەی من فەرمان ڕەوایی دەگرێتە دەست ،ناوی وەكو ناوی منە ، ئەگەر دونیا تەنها یەك ڕۆژی مابێت ،خوای گەورە ئەو ڕۆژە درێژدەكاتەوە تاكو ئەو كەسە فەرمانڕەوایی دەگرێتە دەست .**

( المشكاة ٥٤٥٢ )




## بابەتی سزای ناو گۆڕ[1]

٧٨٤١- إذا تشهد أحدكم فليتعوذ من أربع: من عذاب جهنم و عذاب القبر و فتنة المحيا و الممات و من شر المسيح الدجال ثم يدعو لنفسه بما بدا له.

( صحيح ) ( ن ) عن أبي هريرة .

**٧٨٤١- ئەگەر کەسێکتان (تەحیات)ی خوێند ،با لە چوار شت پەنا بە خوا بگرێت ،لە سزای دۆزەخ و ،سزای گۆڕو ،تاقیکردنەوەی ژیان و مردن و ،خراپەی مەسیحی درۆزن ، ئینجا بپاڕێتەوە بۆ خۆی هەرچی بە چاك دەزانێت.**

( صحيح ابي داود ٩٠٣ )

٧٨٤٢- إذا فرغ أحدكم من التشهد الأخير فليتعوذ بالله من أربع يقول: اللهم إني أعوذ بك من عذاب جهنم و من عذاب القبر و من فتنة المحيا و الممات و من شر فتنة المسيح الدجال.

( صحيح ) ( حم م د هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٨٤٢- کاتێك کەسێکتان لە ( تحيات )ی کۆتایی دەبێتەوە با پەنا بگرێت بەخوا لە چوار شت و بلێت : خوایە من پەنات پێدەگرم لە سزای دۆزەخ و ،لە سزای گۆڕو ،لە تاقیکردنەوەی ژیان و مردن و ،خراپەی مەسیحی درۆزن .**

( صحيح ابي داود ٩٠٣ )

[1] مەناوی دەڵێت : بەڵگەکانی کتێب و سوننەت زۆرن لەسەر جێگیر بوونی سزای گۆڕ ،ئەهلی سوننەت بە کۆ دەنگی لەسەر ئەوەن کە سزای گۆڕ هەیە ... غەزالی دەڵێت : هەرکەس نکۆڵی لێ بکات لە ئەهلی بیدعەیە ( ابن القيم ) دەڵێت ،سزای گۆڕ دووجۆرە : بەردەوام ،ئەوەش بۆ بێباوەڕان و هەندێ لە یاخی بووانە ،کاتیش بۆ ئەوانەیە کە گوناهی سووکیان هەیە .

٧٨٤٣- إذا فرغ أحدكم من صلاته فليدع بأربع ثم ليدع بعد بما شاء: اللهم إني أعوذ بك من عذاب جهنم و عذاب القبر و فتنة المحيا و الممات و فتنة المسيح الدجال.

( صحيح ) ( هق ) عن أبي هريرة .

**٧٨٤٣- كاتێك كەسێكتان لە نوێژەكەی بوموە ،با چوار نزا بكات و ،ئینجا دوای هەرچی دەیەوێت با بۆی بپاڕێتەوە : خوایە من پەنات پێدەگرم لە سزای دۆزەخ و ،سزای گۆڕ و ، تاقیكردنەوەی ژیان مردن و ،تاقیكردنەوەی مەسیحی درۆزن .**

( ألارواء ٣٥٠ )

٧٨٤٤- إذا مات أحدكم عرض عليه مقعده بالغداة و العشي إن كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة و إن كان من أهل النار فمن أهل النار يقال له: هذا مقعدك حتى يبعثك الله إليه يوم القيامة.

( صحيح ) ( ق ت هـ ) عن ابن عمر .

**٧٨٤٤- كاتێك كەسێكتان دەمرن ،ئەگەر بەهەشتی بێت بەیانی و ئێوارە جێگاكەی لە بە هەشت پیشان دەدرێت ،ئەگەر دۆزەخیش بێت پێی دەوترێت : ئەوە جێگاكەتە تاكو خوای گەورە زیندووت دەكاتەوە بۆ ڕۆژی قیامەت .**

( المشكاة ١٢٧ )

٧٨٤٥- إن العبد المؤمن إذا كان في انقطاع من الدنيا و إقبال من الآخرة نزل إليه من السماء ملائكة بيض الوجوه كأن وجوههم الشمس معهم كفن من أكفان الجنة و حنوط من حنوط الجنة حتى يجلسوا منه مد البصر ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند رأسه فيقول: أيتها النفس الطيبة اخرجي إلى مغفرة من الله و رضوان فتخرج فتسيل كما تسيل القطرة من في السقاء فيأخذها فإذا أخذها لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يأخذوها فيجعلوها في ذلك الكفن و في ذلك الحنوط و يخرج منها كأطيب نفحة مسك وجدت على وجه الأرض فيصعدون بها فلا يمرون على ملأ من الملائكة إلا قالوا ما هذا الروح الطيب ؟ فيقولون: فلان بن فلان بأحسن أسمائه التي كانوا يسمونه بها في الدنيا حتى ينتهوا به إلى سماء الدنيا فيستفتحون له فيفتح له فيشيعه من كل سماء مقربوها إلى السماء التي تليها حتى ينتهي إلى السماء السابعة فيقول الله عز و جل: اكتبوا كتاب عبدي في عليين و أعيدوا عبدي إلى الأرض فإني منها خلقتهم و فيها أعيدهم و منها أخرجهم تارة أخرى " فتعاد روحه فيأتيه ملكان فيجلسانه فيقولان له: من ربك ؟ فيقول: ربي الله فيقولان له: ما دينك ؟ فيقول: ديني الإسلام فيقولان له: ما هذا الرجل

الذي بعث فيكم ؟ فيقول: هو رسول الله فيقولان له: و ما علمك ؟ فيقول: قرأت كتاب الله فآمنت به و صدقت فينادي مناد من السماء: أن صدق عبدي فأفرشوه من الجنة و ألبسوه من الجنة و افتحوا له بابا إلى الجنة فيأتيه من روحها و طيبها و يفسح له في قبره مد بصره و يأتيه رجل حسن الوجه حسن الثياب طيب الريح فيقول: أبشر بالذي يسرك هذا يومك الذي كنت توعد فيقول له: من أنت ؟ فوجهك الوجه يجيء بالخير فيقول: أنا عملك الصالح فيقول: رب أقم الساعة رب أقم الساعة ؟ حتى أرجع إلى أهلي و مالي " و إن العبد الكافر إذا كان في انقطاع من الدنيا و إقبال من الآخرة نزل إليه من السماء ملائكة سود الوجوه معهم المسوح فيجلسون منه مد البصر ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند رأسه فيقول: أيتها النفس الخبيثة ! اخرجي إلى سخط من الله و غضب فتفرق في جسده فينتزعها كما ينتزع السفود من الصوف المبلول فيأخذها فإذا أخذها لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يجعلوها في تلك المسوح و يخرج منها كأنتن ريح جيفة وجدت على وجه الأرض فيصعدون بها فلا يمرون بها على ملأ من الملائكة إلا قالوا ما هذا الروح الخبيث ؟ ! فيقولون: فلان بن فلان بأقبح أسمائه التي كان يسمى بها في الدنيا فيستفتح له فلا يفتح له ثم قرأ: ( لا تفتح لهم أبواب السماء فيقول الله عز و جل: اكتبوا كتابه في سجين في الأرض السفلى فتطرح روحه طرحا فتعاد روحه في جسده " و يأتيه ملكان فيجلسانه فيقولان له: من ربك ؟ فيقول: هاه هاه لا أدري فيقولان له: ما دينك ؟ فيقول: هاه هاه لا أدري فيقولان له: ما هذا الرجل الذي بعث فيكم ؟ فيقول: هاه هاه لا أدري فينادي مناد من السماء: أن كذب عبدي فأفرشوه من النار و افتحوا له بابا إلى النار فيأتيه من حرها و سمومها و يضيق عليه قبره حتى تختلف أضلاعه و يأتيه رجل قبيح الوجه قبيح الثياب منتن الريح فيقول: أبشر بالذي يسوؤك هذا يومك الذي كنت توعد فيقول: من أنت فوجهك الوجه يجيء بالشر ؟ فيقول: أنا عملك الخبيث فيقول: رب لا تقم الساعة ) .

( صحيح ) ( حم د ابن خزيمة ك هب الضياء ) عن البراء .

**٧٨٤٥- بەڕاستی كە بەندەی باوەڕدار لە كاتی دابڕان لە دونیا و بەرەو دوا ڕۆژدا بوو لە ئاسمانە فریشتە گەلێكی ڕوخیار سپی كە ڕوخساریان دەڵێی خۆرە دێنە لای پۆشاك و كفنی و بۆنی خۆشی لە گولاوی بەهەشتیان پێیە لە لای دادەنیشن هەتا چاوبڕیكات ئینجا فریشتەی گیانكێشان دێت و لەلای سەریەوە دادەنیشێت و دەفەرموێت : ئەی گیانە پاكەكە وەرە دەرەوە بۆ لای لێخۆشبوون و ڕەزامەندی پەروەردگارت ئیتر دێنە دەرەوە هەر**

وەكو دڵۆپە ئاوێك لە زارى گۆزە بەردەبێتەوە يەكسەر هەڵيدەگرێت كە هەڵيگرت چاوتروكاندنێك بە دەستيەوە وازى لىَ ناهێنێت هەتا لەو كفن و بۆنە خۆشەيەوە نەپێچێت دەيبەن وەكو خۆشترين بۆنى نەسيمى ميسك كەلەسەر زەوى هەڵيدەكات بەرزى دەكەنەوە بەلاى هيچ دەستە فريشتەيەكدا تێنا پەڕن كە نەپرسن ئەرىَ ئەم بۆنە خۆشە چييە ؟ دەڵێن : فلأنى كورِى فلأنە بە جوانترين ناوێك كە پێى ناونراوە و پێى بانگ كراوە لە دونيادا هەتا دەيگەيەننە ئاسمانى يەكەم لە دەرگا دەدەن و داوا دەكەن بۆى بكەنەوە ئەوانيش بۆى دەكەنەوە لەهەموو ئاسمانەكان ئاوا بەڕێى دەكەن هەتا لەو ئاسمانەى نزيك دەكەنەوە كە لە دواى ئەو دێت هەتا دەيگەيەننە ئاسمانى حەوتەم، ئيتر خوا (( جل جلاله )) دەفەرموێت پەڕاوى ئەم بەندەيەم لەناو هەرە بەرزو بڵندەكان بنوسن و بەندەكەم بگێڕنەوە بۆ دونيا چونكە بێگومان من لەو زەويە دروستم كردووە و دەشيكەمەوە بە خاكى ئەو زەويە و جارێكى تريش لە زەوى دەريدەهێنمەوە ، ئيتر گيانى بەبەردا دەكەنەوەو دوو فريشتە دێتە لاى و داى دەنيشێنن و پێى دەڵێن . كێيە پەروەردگارت ؟ دەڵىَ : پەروەردگارم الله يە ، پێى دەڵێن : دينت چيە ؟ دەڵىَ : دينم ئيسلامە ، پێى دەڵێن : ئەو پياوە چكارە بوو كە لەناو ئێوەدا ڕەوانە كرابوو ، دەڵىَ : ئەو پێغەمبەرى خوايە ، پێى دەڵێن : چۆن دەزانى ؟ دەڵىَ : پەڕاوى خوام خوێندەوە و بڕوام هێنا و بەڕاستم زانى . جاڕدەرێك لە ئاسمانەوە بانگدەكات : كە بەندەكەم ڕاست دەكات ، ڕاخەرى بەهەشتى بۆ ڕاخەن ، پۆشاكى بەهەشتى لەبەركەن دەرگايەكيشى بۆ بكەنەوە ڕووەو بەهەشت با بۆن و بەرامەو نەسيمى بەهەشتى بۆ بێت ، ئەوەندەى چاوى پڕ بكات گۆڕەكەشى بۆ فراوان بكەن ، ئيتر پياوێكى ڕوخسار جوانى پۆشاك جوانى بۆنخۆش دێت بۆ لاى و پێى دەڵىَ مژدە بێت كە كارت بۆ ئاسان بوو ، ئەمە ئەو ڕۆژەيە بەڵێنت پىَ درابوو ، دەڵىَ تۆكێى ؟ ڕوخسارت خێرى پێوە ديارە دەڵىَ : من كردەوە چاكەكانتم ، دەڵىَ : خوايە كاتى دياريكراو (( قيامەت )) بهێنە ، خوايە كاتى ديارى كراو بهێنە . هەتا بگەڕێمەوە بۆ ناو خانەوادەو ماڵى خۆم . بەندەى بىَ باوەڕيش كاتێك دەمى لە دونيا دەرچوون و ڕووەو دوا ڕۆژ چۆنيەتى كۆمەڵىَ فريشتەى ڕوخسار ڕەشى دێنە خوار بۆ لاى و پۆشاكى زبريان پىَ يە ئەوەندەى چاوى پڕ بكات لەلاى دادەنيشن ، ئينجا فريشتەى گيانكێشان دێت و لەلاى سەريەوە دادەنيشێت و دەڵىَ ئەى گيانى پيس ! وەرە دەرەوە بەرەو

ڕق و تورەیی خوا ، لە لاشەیدا بلاّودەبێتەوە ڕایدەکێشتێتە دەرەوە هەروەکو چۆن داری درکاوی بەناو لۆکەی تەردا ڕادەکێشرێت هەڵیدەگرێت لە دەریهێنا لە دەستی خۆیدا یەك چاو تروکان ڕایناگرێ هەتا لەو پۆشاکە زبرەیەوە دەهاڵێنێت ، کە گیانەکەی دێتە دەر وەکو بۆگەنترین لەکە تۆپیو وایە لەسەر ڕووی زەوی ، یەکسەر بەرزی دەکەنەوە ، بەلای هیچ کۆمەڵە فریشتەیەکدا تێنا پەڕن کە پێی نەڵێن : ئەرێ ئەم گیانە چەپەڵە کێیە ؟ دەڵێن : فلاّنی کوڕی فلاّنە بە ناخۆشترین ناوێك کە لە دونیادا پێی بانگکراوە لە دەرگای ئاسمان دەدەن بۆی ناکەنەوە ، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێند : ﴿لا تُفَتحُ لَهم ابواب السماء ﴾ الاعراف ٤٠ خوا عزوجل دەفەرموێت : نامەکەی لە پەڕاوی ڕەشدا بنوسن لە ناو زەوی نزمدا ، ئیتر یەکسەر گیانەکەی توڕ دەدرێ[1] گیانەکەش دەستبەجێ دەچێتەوە ناو لاشەکەیەوە دوو فریشتە دێن بۆ لای لەلای دادەنیشن و پێی دەڵێن : کێ پەروەردگارتە ؟ دەڵێ هاها نازانم ، پێی دەڵێن : دینت چیە ؟ دەڵێ ها ها نازانم ، پێی دەڵێن : ئەو پیاوە چکارە بوو کە لەناوتاندا ڕەوانەکرابوو ؟ دەڵێ : ها ها نازانم : جاردەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات : بەندەکەم درۆ دەکات لە ڕاخەری دۆزەخی بۆ ڕاخەن و دەرگایەکی لەڕوی دۆزەخەوە بۆ بکەنەوە با گڕمو گەرمای دۆزەخی بۆ بێت و گۆڕەکەی لێ تەنگ بێتە هەتا پەراسوەکانی تێك دەئاڵێن ئەوجا پیاوێکی ڕوخسار ناشرینی پۆشاك ناشرینی بۆن ناخۆش دێت بۆلای و دەڵێ : مژدە بێت بەهەر شتێك پێتناخۆشە ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێ درابوو دەڵێ : تۆ کێی ڕوخسارت خێری پێوە دیار نییە ؟ دەڵێ : من کردەوە خراپەکانتم ، دەڵێ پەروەردگار کاتی دیاریکراو (( قیامەت )) مەهێنە .

(الجنائز ١٥٥)

٧٨٤٦- إن الله ليزيد الكافر عذابا ببكاء أهله عليه.

( صحيح ) ( خ ن ) عن عائشة .

**٧٨٤٦-بێگومان خوای گەورە سزای بێباوەڕ زیاتر دەکات بەگریانی کەس وکاری لەسەری.**

( المشكاة ١٧٤٢ )

٧٨٤٧- إن الله يزيد الكافر عذابا ببعض بكاء أهله عليه

( صحيح ) ( ن ) عن عائشة .

---

[1] واتە : بەناشرینی فڕێ دەدرێت .

**٧٨٤٧- بەراستى خواى گەورە سزاى بێباوەڕ زیاد دەكا بە هەندێ گریانی كەس و كارەكەی لەسەری.**

( المشكاة ١٧٤٢ )

٧٨٤٨- إن المؤمن إذا وضع في قبره أتاه ملك فيقول له: ما كنت تعبد ؟ فإن الله هداه قال: كنت أعبد الله فيقول له: ما كنت تقول في هذا الرجل ؟ فيقول: هو عبد الله و رسوله فما يسأل عن شيء غيرها فينطلق به إلى بيت كان في النار فيقال له: هذا بيتك كان في النار و لكن الله عصمك و رحمك فأبدلك به بيتا في الجنة فيقول: دعوني حتى أذهب فأبشر أهلي فيقال له: اسكن" و إن الكافر إذا وضع في قبره أتاه ملك فينتهره فيقول له: ما كنت تعبد ؟ فيقول: لا أدري فيقال له: لا دريت و لا تليت فيقال: فما كنت تقول في هذا الرجل ؟ فيقول: كنت أقول ما تقول الناس فيضربه بمطراق من حديد بين أذنيه فيصيح صيحة يسمعها الخلق غير الثقلين.

( صحيح ) ( د ) عن أنس .

**٧٨٤٨- بڕوادار كاتێك دەخرێتە گۆڕ فریشتەیەك دێتە لای و پێ دەڵێت : چیت دەپەرست؟ جا ئەگەر خوای گەورە ڕێنموونی بكات دەڵێت : خوام دەپەرست ،ئەویش پێی دەڵێت لە بارەی ئەو پیاوە چیت دەووت ؟ دەڵێت : ئەو بەندەو پێغەمبەری خوایە ، ئیتر پرسیاری هیچی تری لێناكرێت ،ئینجا دەبرێت بۆماڵێك لە دۆزەخداو پێی دەوترێت : ئەوە ماڵی تۆ بوو لە دۆزەخدا ،بەڵام خوای گەورە پاراستیت و میهرەبانی نواند بەرانبەرت ،ئیتر ئەو ماڵەی بۆ گۆڕیت بە ماڵێك لە بەهەشتدا ،دەڵێت : وازم لێبهێنن تاكو بڕۆم و مژدە بدەم بە كەس و كارم ،ئینجا پێی دەوترێت : دامەزرێ بە .بێباوەڕیش كاتێك دەخرێتە گۆڕەكەی فریشتەیەك دێت و تێی دەخوڕێت و پێی دەڵێت : چیت دەپەرست ؟ دەڵێ : نازانم ،ئیتر پێی دەڵێن : با هەر نەزانیت و هیچ نەڵێیت ،ئینجا دەوترێت چیت دەوت دەربارەی ئەو پیاوە ؟ دەڵێت : منیش قسەی خەڵكم دەكرد دەربارەی ،ئەویش چەكوشێكی ئاسنین دەدات بە نێوان هەردوو گوێیدا ،ئیتر هاوارێك دەكات هەموو بوونەوەرێك دەیبیستێت جگە لە جنۆكەو ئادەمیزاد .**

( الصحيحة ١٣٤٤ )

٧٨٤٩- ألا تسمعون ؟ إن الله لا يعذب بدمع العين و لا بحزن القلب و لكن يعذب بهذا - و أشار إلى لسانه - أو يرحم و إن الميت يعذب ببكاء أهله عليه

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمر .

**٧٨٤٩- ئەرێ نابیستن ؟ بەڕاستی خوای گەورە سزانادات لەسەر فرمێسکی چاو و، پەژارەی دڵ ،بەڵکو لەسەر ئەوە سزادەدا (( ئاماژەی کرد بۆ زمانی )) ،یان میهرەبانی بەرامبەر دەکات ، بەڕاستی مردوویش سزا دەدرێت بەگریانی کەس و کارەکەی بەسەریدا .**

( المشكاة ١٧٢٤ )

٧٨٥٠- أي إخواني لمثل هذا اليوم فأعدوا.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن البراء .

**٧٨٥٠- ئێی براکانم بۆ ڕۆژێکی ئاوها خۆتان ئامادەبکەن** [1]

( الصحيحة ١٧٥١ )

٧٨٥١- إخواني لمثل هذا اليوم فأعدوا.

( صحيح ) ( خط ) عن البراء .

**٧٨٥١- براکانم بۆ ڕۆژێکی ئاوها خۆتان ئامادەبکەن .**

( الترغيب ٣٣٣٨ )

٧٨٥٢- إن للقبر ضغطة لو كان أحد ناجيا منها نجا سعد بن معاذ.

( صحيح ) ( حم ) عن عائشة .

**٧٨٥٢- بەڕاستی گۆڕ فشارێکی هەیە ،ئەگەر کەسێك لێی ڕزگار ببوایە سەعدی کوڕی موعاز لێی ڕزگاری دەبوو .**

( الصحيحة ١٦٩٥ )

٧٨٥٣- إن هذه القبور ممتلئة على أهلها ظلمة و إن الله ينورها لهم بصلاتي عليهم.

( صحيح ) ( حم ) عن أنس ( م ) عن أبي هريرة .

**٧٨٥٣- بەڕاستی ئەو گۆڕانە پڕن لە تاریکی بۆ مردووەکان ،خوای گەورەیش بە پاڕانەوەی من بۆیان ڕووناك دەکاتەوە .**

( الارواء ٧٢٨ )

٧٨٥٤- استجيروا بالله من عذاب القبر فإن عذاب القبر حق.

( صحيح ) ( طب ) عن أم خالد بنت خالد بن سعيد بن العاص.

---

[1] **واتە : بۆ ئەو کاتەی کەسێك لە ئێوە دادەهێلرێنە ناو گۆڕەکەی ،ئەو کاتەش پێغەمبەر ﷺ لەسەر لێواری گۆڕەکە ڕاوەستابوو ...**

**٧٨٥٤- پەنا بگرن بە خوا لە سزای گۆڕ ، چونکە سزای گۆڕ هەقە .**

( الصحيحة ١٤٤٤ )

٧٨٥٥- إنه أوحي إلي أنكم تفتنون في القبور.

( صحيح ) ( ن ) عن عائشة .

**٧٨٥٥- بەڕاستی من (( وەحیم )) نیگام بۆ هاتووە کە ئێوە گۆڕەکانتاندا دوچاری تاقیکردنەوە دەبن.**

( صحيح النسائي ١٤٧٦ )

٧٨٥٦- استعيذوا بالله من عذاب القبر إنهم يعذبون في قبورهم عذابا تسمعه البهائم.

( صحيح ) ( حم طب ) عن أم مبشر .

**٧٨٥٦- پەنا بەخوا بگرن لە سزای گۆڕ ،ئەوانە لە گۆڕەکانیاندا ئەشکە نجەیەك دەدرێن ئاژەڵەکان دەیبیستن .**

( الصحيحة ١٤٤٤ )

٧٨٥٧- أما فتنة الدجال فإنه لم يكن نبي إلا قد حذر أمته و سأحذركموه بحديث لم يحذره نبي أمته إنه أعور و إن الله ليس بأعور مكتوب بين عينيه كافر يقرأه كل مؤمن " و أما فتنة القبر فبي تفتنون و عني تسألون فإذا كان الرجل الصالح أجلس في قبره غير فزع ثم يقال له: ما هذا الرجل الذي كان فيكم ؟ فيقول: محمد رسول الله جاءنا بالبينات من عند الله فصدقناه فيفرج له فرجة قبل النار فينظر إليها يحطم بعضها بعضا فيقال له: انظر إلى ما وقاك الله ثم يفرج له فرجة إلى الجنة فينظر إلى زهرتها و ما فيها فيقال له: هذا مقعدك منها و يقال له: على اليقين كنت و عليه مت و عليه تبعث إن شاء الله و إذا كان الرجل السوء أجلس في قبره فزعا فيقال له: ما كنت تقول ؟ فيقول: لا أدري فيقال: ما هذا الرجل الذي كان فيكم ؟ فيقول: سمعت الناس يقولون قولا فقلت كما قالوا فيفرج له فرجة من قبل الجنة فينظر إلى زهرتها و ما فيها فيقال له: انظر إلى ما صرف الله عنك ثم يفرج له فرجة قبل النار فينظر إليها يحطم بعضها بعضا و يقال: هذا مقعدك منها على الشك كنت و عليه مت و عليه تبعث إن شاء الله ثم يعذب.

( صحيح ) ( حم ) عن عائشة .

**٧٨٥٧- سەبارەت بە تاقیکردنەوەی دەججال ،هەموو پێغەمبەرێك ئوممەتەکەی خۆی لێ ئاگادار کردووەتەوە ،منیش بە قسەیەك ئاگادارتان دەکەمەوە هیچ کەس لە پێش مندا**

نەیكردووە ،ئەو یەك كەڵە چاوە بەڵام خوای گەورە وانییە ،لە نێوان ناوچاوانیدا نوسراوە بێباوەڕ ،هەموو بڕوادارێك دەیخوێنێتەوە ،سەبارەت بە تاقیكردنەوەی گۆڕیش بە من تاقیدەكرێنەوە و ،دەربارەی من لێتان دەپرسن ،جا ئەگەر ئەو كەسە پیاو چاك بێت ،دادەنیشرێ لە گۆڕەكەیدا بە بێ ترس و بیم و ، پێی دەوترێت : ئەو پیاوە چی یەكە لە نێوتاندا بوو ؟ دەڵێت : موحەممەد پێغەمبەری خوا بوو، و لە لای خواوە بەڵگەی بۆ هێناین و باوەڕمان پێكرد ،ئیتر كەلێنێكی بۆدەكرێتە ڕووەو دۆزەخ و ،تەماشای دەكات چۆن خۆی خۆی دەخواتەوە و پێی دەوترێت : ،بڕوانە خوای گەورە لە چی تۆی پاراستوە ،ئینجا كەلێنێكی بۆ دەكرێتەوە بەرەو بەهەشت و ،تەماشای گوڵوگوڵزارەكان و شتەكانی ناوی دەكات و پێی دەوترێت : ئەوە جێگای تۆیە لە بەهەشتدا ،ئینجا پێی دەوترێت تۆ بێگومان دڵنیا بوویت ولەسەر دڵنیایی مردیت و ،لەسەریشی زیندوو دەكرێیتەوە بە ویستی خوای گەورە ،جا كاتێك پیاوی خراپەكار بە ترسەوە لە گۆڕەكەیدا دادەنیشێت ، پێی دەوترێت : چیت دەووت ؟ دەڵێ : نازانم . پێی دەوترێت : ئەو پیاوە چی بوو لە ناوتاندا بوو ؟ دەڵێ : گوێم لە خەڵكی بوو قسەیەكیان دەكرد ئیتر منیش وەكو ئەوان هەر ئەو قسەیەم دەكرد ،ئینجا كەلێنێكی بۆ دەكرێتەوە بەرەو بەهشت ،سەیری گوڵوگوڵزارو خۆشیەكانی دەكات و ، پێی دەوترێت : تەماشاكە خوای گەورە چی لێ كە كیسیدایت ،ئینجا كەلێنێكی تەماشاكردنی بۆ دەكرێتەوە بەرەو دۆزەخ و ، تەماشای دەكات چۆن خۆی خۆی دەخواتەوە و ، پێی دەوترێت ئەوە جێگاكەتە لە دۆزەخدا هەر گوماندا بوویت و لەسەر گومان مردویت و لەسەریشی زیندوو دەكرێیتەوە ، بەویستی خوای گەورە ،ئینجا سزا دەدرێت .

( الترغيب ٣٥٥٧ )

٧٨٥٨- إن القبر أول منازل الآخرة فإن نجا منه فما بعده أيسر منه و إن لم ينج منه فما بعده أشد منه.

( صحيح ) ( ت هـ ك ) عن عثمان بن عفان .

**٧٨٥٨- گۆڕ یەكەمین ئارامگەی دواڕۆژە ،ئەگەر لەوەتی قوتاربێت دوای ئەو لەو ئاسانترە، ئەگەر لێشی قوتار نەبێت ئەوەی دوای ئەو سەخترە .**

( المشكاة ١٣٢ )

٧٨٥٩- إن الموتى ليعذبون في قبورهم حتى إن البهائم لتسمع أصواتهم.

( صحيح ) ( طب ) ابن مسعود .

**٧٨٥٩- بەڕاستی مردووەكان لە گۆڕەكانیاندا ئەشكەنجە دەدرێن ، هەتاتەنانەت ئاژەڵەكانیش گوێیان لە دەنگیانە .**

( الصحيحة ٦٣٧٧ )

٧٨٦٠- إن الميت إذا دفن سمع خفق نعالهم إذا ولوا عنه منصرفين.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس .

**٧٨٦٠- مردوو كاتێك كە دەنێژرێت ،دەنگی پێڵاوەكانیان دەبیستێ كاتێك لەسەر گۆڕەكە دەگەڕێنەوە .**

( الترغيب ٣٥٦١ )

٧٨٦١- إن الميت تحضره الملائكة فإذا كان الرجل صالحا قال: اخرجي أيتها النفس الطيبة كانت في الجسد الطيب اخرجي حميدة و أبشري بروح و ريحان و رب غير غضبان فلا يزال يقال لها ذلك حتى تخرج ثم يعرج بها إلى السماء فيستفتح لها فيقال: من هذا ؟ فيقول: فلان فيقال: مرحبا بالنفس الطيبة كانت في الجسد الطيب ادخلي حميدة و أبشري بروح و ريحان و رب غير غضبان فلا يزال يقال لها ذلك حتى ينتهي بها إلى السماء التي فيها الله تبارك و تعالى " فإذا كان الرجل السوء قال اخرجي أيتها النفس الخبيثة كانت في الجسد الخبيث اخرجي ذميمة و أبشري بحميم و غساق و آخر من شكله أزواج فلا يزال يقال لها ذلك حتى تخرج ثم يعرج بها إلى السماء فيستفتح لها فيقال: من هذا ؟ فيقال: فلان فيقال: لا مرحبا بالنفس الخبيثة كانت في الجسد الخبيث ارجعي ذميمة فإنها لا تفتح لك أبواب السماء فترسل من السماء ثم تصير إلى القبر " فيجلس الرجل الصالح في قبره غير فزع و لا مشعوف ثم يقال له: فيم كنت ؟ فيقول: كنت في الإسلام فيقال له: ما هذا الرجل ؟ فيقول: محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم جاءنا بالبينات من عند الله فصدقناه فيقال له: هل رأيت الله ؟ فيقول: ما ينبغي لأحد أن يرى الله فيفرج له فرجة قبل النار فينظر إليها يحطم بعضها بعضا فيقال له: انظر إلى ما وقاك الله تعالى ثم يفرج له فرجة قبل الجنة فينظر إلى زهرتها و ما فيها فيقال له: هذا مقعدك و يقال له: على اليقين كنت و عليه مت و عليه تبعث إن شاء الله " و يجلس الرجل السوء في قبره فزعا مشعوفا فيقال له: فيم كنت ؟ فيقول: لا أدري فيقال له: ما هذا الرجل ؟ فيقول: سمعت الناس يقولون قولا

فقلته ! فيفرج له فرجة قبل الجنة فينظر إلى زهرتها و ما فيها فيقال له: انظر إلى ما صرف الله عنك ثم يفرج له فرجة إلى النار فينظر إليها يحطم بعضها بعضا فيقال: هذا مقعدك على الشك كنت و عليه مت و عليه تبعث إن شاء الله.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٨٦١- بێگومان فریشتە لەلای مردوو ئامادە دەبن جا ئەگەر پیاو چاك بێت دەفەموێ : ئەی گیانی پاك وەرە دەرەوە لەو لاشە پاکەدا ، وەرە دەر بەرێزەوە و مژدەبێت بە ئاسودەی و بۆنی خۆش و بەبێ تورەبوونی پەرەدگار بەردەوام وای پێ دەوترێت هەتا دەردەچێت ، ئینجا بەرزدەكرێتەوە بۆ ئاسمان بۆی لە دەرگا دەدرێت دەوترێت : ئەوە كێیە ؟ دەڵێ : فلأنە دەوترێت : خۆشهات گیانی پاك كە لە لاشەی پاكدا بووە بەرێزەوە مژدە بێت بە ئاسودەی و بۆنی خۆش و بەبێ تورەبوونی پەروەردگار ، بەردەوام وای پێ دەوترێت هەتا دەگاتە ئەو ئاسمانەی پەروەردگاری لێیە . ئەگەر كەسەكەش خراپ بوو دەفەرموێت وەرە دەرەوە ئەی گیانی پیس كە لەلاشەی پیسدا بوو ، وەرە دەر بەرپیسوایی و ، مژدە بێت بە گرمو كێماو ، لەومو دواش هەر بەهەمان شێوە ، بەردەوام وای پێ دەوترێت هەتا دەردەچێت ، ئینجا بەرز دەكرێتەوە بۆ ئاسمان بۆی لە دەرگا دەدرێت دەوترێت : ئەوە كێیە ؟ دەوترێت : فلأنە . ئینجا دەوترێت گیان و دەرونی پیس كە هەتا ئێستا لە لاشەی پیسدا بووە بەخێر نەیەت بگەرێتەوە بە رپسوایی ، بێگومان دەرگای ئاسمانت بۆ ناكرێتەوە لە ئاسمانەوە رەوانە دەكرێت تا دەگاتە ناو گۆرکە بەلأم پیاو چاك لە گۆرەكەیدا دادەنیشێت بەبێ ترس و بیم و نابەدڵی ئینجا پێی دەترێت : تۆ لەچی بەرنامەیەكدا بوی ؟ دەڵێ : من لە ئیسلامدا بووم ، پێی دەوترێت : ئەو پیاوە چی بوو ؟ دەڵێ : محمد پێغەمبەری خوا بوو سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت . لەلایەن خواوە بە بەڵگە گەلێكی رون و ئاشكاروە هاتبوو بۆ لامان و ئێمەش بەراستمان زانی . پێی دەوترێت ئایا خوات بینیوە ؟ دەڵێ : ناگونجێ بۆ هیچ خوا ببینێت ، ئیتر كەلێنێكی رومو دۆزەخ بۆ دەكرێتەوە سەیری دەكات هەندێكی هەندێكی دەخوات پێی دەوترێت : سەیركە خوا لەچی پاراستوتی ، ئینجا كەلێنێكی رومو بەهەشت بۆ دەكرێتەوە سەیری گوڵوگوڵزاری ناو بەهەشت دەكات ، پێی دەوترێت : ئا ئەوە شوێنتە و پێی دەوترێت تۆ دڵنیا بویت و بەدڵنیایی مردویت و لەسەر دڵنیایی زیندوو دەكرێیتەوە بەویستی خوا ،**

پیاو خراپیش لە گۆڕەکەیدا دادەنیشێت بە ترس و بیم دڵەتەپێ و پێی دەوترێت تۆ لە چی بەرنامەیەکدا بوی ؟ دەڵێ : نازانم ، پێی دەوترێت ، ئەو پیاوە چی بوو ؟[1] دەڵێ لە خەڵکم دەبیست قسەیەکیان دەکرد دووبارەیان دەکردەوەو منیش دەموتەوە : ئیتر کەلێنێکی رووەو بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە و سەیری گوڵوگوڵزارو شتەکانی ناو بەهەشت دەکات ، پێی دەوترێت : سەیرکە خوا چی لێ لادایت ، ئینجا کەلێنێکی رووەو ئاگر بۆ دەکرێتەوە سەیر دەکات هەندێکی هەندێکی تر تێکدەشکێنێت . دەوترێ : ئا ئەوە شوێنتە ، تۆ کاتێ هەبوو بە گومانەوە مردی و لەسەر گومانەکەشت زیندو دەکرێیتەوە بەویستی خوا .

٧٨٦٢- إن الميت ليعذب ببكاء الحي.

( صحيح ) ( ق ) عن عمر .

**٧٨٦٢- بەڕاستی مردوو سزا دەدرێت بە گریانی زیندوو .**

( المشكاة ١٧٤١ )

٧٨٦٣- إن الميت ليعذب ببكاء أهله عليه.

( صحيح ) ( حم ق ٣ ) عن ابن عمر .

**٧٨٦٣- بەڕاستی مردوو سزا دەدرێت بە گریانی کەس و کارەکەی لەسەری.**

( المشكاة ١٧٤١ )

٧٨٦٤- إن هذه الأمة تبتلى في قبورها فلولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يسمعكم من عذاب القبر الذي أسمع منه تعوذوا بالله من عذاب النار تعوذوا بالله من عذاب القبر تعوذوا بالله من الفتن ما ظهر منها و ما بطن تعوذوا بالله من فتنة الدجال.

( صحيح ) ( حم م ) عن زيد بن ثابت .

**٧٨٦٤- ئەم ئوممەتە لە گۆڕەکەیدا دوچاری تاقیکردنەوە دەبێت ،ئەگر ترسی ئەوەم نەبوایە ئیتر مردوو نەنێژن ، لە خوا دەپاڕمەوە کە سزای گۆڕتان پێ ببیستێ وەکو من دەبیستم ، پەنا بە خوا بگرن لە سزای دۆزەخ ، پەنا بە خوا بگرن لە سزای گۆڕ ، پەنا بە خوا بگرن لە ئاژاوە دیارو شاراوەکان ، پەنا بە خوا بگرن لە تاقیکردنەوەی دەججال .**

( الصحيحة ١٥٩ )

---

[1] واتە : دەربارەی پێغەمبەر پرسیاری لێ دەکەن ( ﷺ )

٧٨٦٥- سورة تبارك هي المانعة من عذاب القبر.

( صحيح ) ( ابن مردويه ) عن ابن مسعود.

**٧٨٦٥- سورەتى تەبارەك ڕێگرە لە سزای گۆڕ .**

( الصحيحة ١١٤٠ )

٧٨٦٦- عذاب القبر حق .

( صحيح ) ( خط ) عن عائشة.

**٧٨٦٦- سزای گۆڕ هەقە .**

( الصحيحة ١٣١١ )

٧٨٦٧- عوذوا بالله من عذاب القبر عوذوا بالله من عذاب النار عوذوا بالله من فتنة المسيح الدجال عوذوا بالله من فتنة المحيا و الممات .

( صحيح ) ( م ن ) عن أبي هريرة.

**٧٨٦٧- پەنا بە خوا بگرن لە سزای گۆڕ ، پەنا بە خوا بگرن لە سزای دۆزەخ پەنا بە خوا بگرن لە تاقیکردنەوەی مەسیحی دەججال ، پەنا بە خوا بگرن لە تاقیکردنەوەی ژیان و مردن .**

( صحيح النسائي ٥٥٠٨ )

٧٨٦٨- قد سألت الله لآجال مضروبة و أيام معدودة و أرزاق مقسومة لا يعجل شيئا منها قبل حله و لا يؤخر منها شيئا بعد حله و لو كنت سألت الله أن يعيذك من عذاب في النار و عذاب في القبر كان خيرا لك و أفضل.

( صحيح ) ( حم م ) عن ابن مسعود.

**٧٨٦٨- بەڕاستی داوای لەخوا کرد بۆ کاتگەلێکی دیاریکراو و ،ڕۆژانێکی ژمێردراوو ، ڕۆزییەکی دابەشکراو ، پاڕانەوە ئەوانە پاش و پێش ناخات ،ئەگەر داوایشت بکردایە خوای گەورە پەناتت بدات لە سزای دۆزەخ و سزای گۆڕ و ئەوە بۆ تۆ چاکتر بوو [1] .**

( السنة ٢٦٢ )

٧٨٦٩- لو أفلت أحد من ضمة القبر لأفلت هذا الصبي.

( صحيح ) ( طب ) عن أبي أيوب.

---

**[1] ئەوەی بە ( ئوم حەبیبە ) فەرموو کاتێك وتی : خوایە خۆشحاڵم بکە بە هاوسەرم پێغەمبەری خواو ،ئەبو سوفیانی باوکم و ،موعاوییەی برام .**

**٧٨٦٩- ئەگەر کەسێك لە گۆڕەو شار دەرباز ببوایە ئەو منالّە دەرباز دەبوو .**

( الصحيحة ٢١٦٤ )

٧٨٧٠- لو نجا أحد من ضمة القبر لنجا سعد بن معاذ و لقد ضم ضمة ثم روخي عنه.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٧٨٧٠- ئەگەر کەسێك دەرباز ببوایە لە گۆڕەوشار ئەوە سەعدی کوڕی موعاز دەرباز دەبوو ،یەکجار گۆڕەوشار درا ئینجا ڕزگاری بوو .**

( الصحيحة ١٦٨٥ )

٧٨٧١- لو نجا أحد من ضمة القبر لنجا هذا الصبي.

( صحيح ) ( ع الضياء ) عن أنس.

**٧٨٧١- ئەگەر کەسێك لە گۆڕەو شار دەرباز بوایە ئەو منالّە دەرباز دەبوو .**

( الصحيحة ٢١٦٤ )

٧٨٧٢- لولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يسمعكم عذاب القبر.

( صحيح ) ( حم د م ن ) عن أنس.

**٧٨٧٢- لەبەر ئەوە نەبێت مردووەکانتان نەنێژن ،دەپاڕامەوە خوای گەورە سزای گۆڕتان پێ ببیستێ .**

( الصحيحة ١٥٨ )

٧٨٧٣- ما رأيت منظرا قط إلا و القبر أفظع منه.

( صحيح ) ( ت هـ ك ) عن أبي هريرة.

**٧٨٧٣- هیچ دیمەنێکم نەبینیوە ،کە گۆڕ لەو ترسناکترنەبێت .**

( المشكاة ١٣٢ )

٧٨٧٤- ما من شيء لم أكن أريته إلا رأيته في مقامي هذا حتى الجنة و النار و لقد أوحي إلى أنكم تفتنون في قبوركم مثل أو قريبا من فتنة المسيح الدجال يؤتى أحدكم فيقال له: ما علمك بهذا الرجل ؟ فأما المؤمن أو الموقن فيقول: هو محمد رسول الله جاءنا بالبينات و الهدى فأجبنا و آمنا و اتبعنا هو محمد ثلاثا فيقال له: نم صالحا قد علمنا إن كنت لموقنا به و أما المنافق أو المرتاب فيقول: لا أدري سمعت الناس يقولون شيئا فقلته.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أسماء بنت أبي بكر.

**٧٨٧٤- هيچ شتێك نەبوو پيشانم نەدرابێت ،تا هەمويم نيشاندرا لەم جيگەيەم ،تەنانەت بەهەشت و دۆزەخيش ،من وەحيم بۆهاتووە كە ئێوە لە گۆڕەكانتان تووشى تاقيكردنەوە دەبن وەكو يان نزيك لە تاقيكردنەوەى مەسيحى دەججال ،كەسێك لە ئێوە دەهێنرێت و پرسيارى لىٚ دەكرێت : زانياريت چى يە دەربارەى ئەو پياوە ؟ بڕوادار يان كەسى دڵنيا دەڵێت : ئەو موحەممەدە ،پێغەمبەرى خوايە بەڵگەو ڕێنموونى بۆ هێنا بوين، ئێمەش بەگوێمان كرد و باوەڕمان پێهێنا و شوێنى كەوتين ،سىٚ جار دەڵىٚ ئەوە موحەممەدە ،ئينجا پێى دەوترێت بخەوە بە ئاسودەيى ،ئێمە دەمانزانى تۆ لەوەدا دڵنياى ،بەڵام كەسى دووڕوو يان گوماناوى دەڵێت : نازانم گوێم لە خەڵكى بوو شتێكيان وت و منيش وتم .**

( صحيح النسائي ٢١٩٥ )

٧٨٧٥- إذا رأى المؤمن ما فسح له في قبره فيقول: دعوني أبشر أهلي فيقال له: اسكن.

( صحيح ) ( حم الضياء ) عن جابر .

**٧٨٧٥- كاتێك بڕوادار دەبينيت چۆن گۆڕەكەى بۆ فراوان دەكرێت ،دەڵىٚ : لێم گەڕێن با مژدە بە كەس و كارەكەم بدەم ، پێى دەوترێت : ئارام بە .**

( الصحيحة ١٣٤٤ )

٧٨٧٦- إذا قبر الميت أتاه ملكان أسودان أزرقان يقال لأحدهما المنكر و للآخر النكير فيقولان: ما كنت تقول في هذا الرجل ؟ فيقول: ما كان يقول هو: عبد الله و رسوله أشهد أن لا إله إلا الله و أن محمد عبده و رسوله فيقولان: قد كنا نعلم أنك تقول ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعا في سبعين ثم ينور له فيه ثم يقال: نم فيقول: أرجع إلى أهلي فأخبرهم فيقولان: نم كنومة العروس الذي لا يوقظه إلا أحب أهله إليه حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك و إن كان منافقا قال: سمعت الناس يقولون قولا فقلت مثله لا أدري فيقولان: قد كنا نعلم أنك تقول ذلك فيقال للأرض: التئمي عليه فتلتئم عليه فتختلف أضلاعه فلا يزال فيها معذبا حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة .

**٧٨٧٦- كاتێك مردوو دەنێژرێت ،دوو فريشتەى ڕەشى شينى بۆ دێت ،بە يەكێكيان دەوترێت ( منكر ) و بەوى تريش دەوترىٚ ( نكير ) ، پێى دەڵێن چيت دەوت دەربارەى ئەو پياوە ؟ دەڵێت : ئەوەى كە خۆى دەيووت ،بەندەو پێغەمبەرى خوايە ،بڕيار دەدەم هيچ**

**خوايەكى تر نييە جگە لە ( الله )و ،موحەممەديش بەندەو پێغەمبەرى خوايە ،پێى دەڵێن : ئێمە ئەوەمان دەزانى كە تۆ وادەڵێى ،ئينجا حەفتا باڵ گۆڕەكەى بۆ فراوان دەكرێت و بۆى ڕووناك دەكرێتەوە ،ئينجا پێى دەوترێت : بخەوە ،دەڵێت : دەگەڕێمەوە بۆ لاى كەس و كارەكەم ئاگادارييان دەكەمەوە ،پێى دەڵێن بخەوە وەكو ئەو كەسەى زاوايەو خۆشەويسترين كەسى بێدارى دەكاتەوە ،تاكو خواى گەورە لەو جێگايە زيندووى دەكاتەوە ،ئەگەر دووڕوو بێت دەڵێت : گوێم لە خەڵكى بوو قسەيەكيان دەكرد منيش ئەو قسەم دەكرد ،ئيتر بە زەوى دەوترێت ، كۆ ببەرەوەو بيگرە خۆت ،ئينجا پەراسووەكانى بەناويەكدا دەچن ،ئيتر هەر لە سزادا دەبێت تاكو لەوجێگايەدا خوا خواى گەورە زيندووى دەكاتەوە .**

( الصحيحة ١٣٩١ )

٧٨٧٧- إن العبد إذا وضع في قبره و تولى عنه أصحابه حتى أنه يسمع قرع نعالهم أتاه ملكان فيقعدانه فيقولان له: ما كنت تقول في هذا الرجل ؟ لمحمد فأما المؤمن فيقول: أشهد أنه عبد الله و رسوله فيقال: انظر إلى مقعدك من النار قد أبدلك الله به مقعدا من الجنة فيراهما جميعا و يفسح له في قبره سبعون ذراعا و يملأ عليه خضرا إلى يوم يبعثون " و أما الكافر أو المنافق فيقال له ما كنت تقول في هذا الرجل ؟ فيقول: لا أدري كنت أقول ما يقول الناس فيقال له: لا دريت و لا تليت ثم يضرب بمطراق من حديد ضربة بين أذنيه فيصيح صيحة يسمعها من يليه غير الثقلين و يضيق عليه قبره حتى تختلف أضلاعه.

( صحيح ) ( حم ق د ن ) عن أنس .

**٧٨٧٧- مردوو كاتێك دەخرێتە ناو گۆڕەكەى و هاوەڵانى پشتى لێ دەكەن ،تەنانەت گوێى لە دەنگى پێڵاوەكانيانە ،دوو فريشتە دێنە لاى و ،دايدەنيشێنن وپێى دەڵێن : چى دەڵێى دەربارەى ئەو پياوە ؟ -موحەممەد – جا بڕوادار دەڵێت : بڕيار دەدەم ئەو بەندەو پێغەمبەرى خوايە ، پێى دەوترێت : بڕوانە جێگاكەت لە دۆزەخ ،خواى گەورە بۆى گۆڕيتەوە بە جێگايەك لە بەهەشت ،ئيتر هەردووكيان پێكەوە دەبينێ و ،حەفتا باڵ گۆڕەكەى بۆ بەرين دەكرێت ، بۆشى سەوز دەكرێت تاكو ڕۆژى قيامەت ،بەڵام دووڕوو يان بێ باوەڕ :، پێى دەوترێت : چى دەڵێيت دەربارەى ئەو پياوە ؟ دەڵێت : نازانم ،منيش قسەى خەڵكيم دەكرد ، پێى دەوترێت : بەڵكو هەرنەبزانێ و نەهيچيشت ووتوە ،ئينجا چەكوشێك دەدرێت بە نێوان هەردوو گوێيدا ،**

**هاوارێك دەكات هەموو شتێك گوێی لێ دەبێت جگە لە ئادەمیزاد و جنۆكە ،گۆڕەكەشی ئەوەندە بۆ تەنگ دەكرێتەوە پەراسووەكانی بەناو یەكدا دەچن .**

( الصحيحة ١٣٤٤ )

٧٨٧٨- الميت يعذب ببكاء الحي إذا قالوا: وا عضداه ! وا كاسياه ! وا ناصراه ! وا جبلاه ! و نحو هذا يتعتع و يقال أنت كذلك ؟ ! أنت كذلك ؟ !.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن أبي موسى.

**٧٨٧٨- مردوو سزا دەدرێت بە گریانی زیندوو ،كاتێك دەڵێت : هۆ هێزی بازووم ،هۆ داپۆشەرم ! هۆ پشتیوانم ! هۆ چیاكەم[1] ! و ئەو جۆرە قسانە تەتەڵە دەكات و پێی دەوترێت جا تۆ ئاوای ؟ ! تۆ ئاوای ؟ ! .**

( الصحيحة ٥٧٧٠ )

٧٨٧٩- الميت يعذب في قبره بما نيح عليه.

( صحيح ) ( حم ق ن هـ ) عن عمر.

**٧٨٧٩- مردوو سزادەدرێت لە گۆڕەكەیدا بەهۆی ئەو شیوەنەی لەسەری دەكرێت[2] .**

( الجنائز ٢٨ )

## بابەتی حەشرو لێپرسینەوە

٧٨٨٠- آخر من يحشر راعيان من مزينة يريدان المدينة ينعقان بغنمهما فيجدانها وحشا حتى إذا بلغا ثنية الوداع خرا على وجوههما.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة .

**٧٨٨٠- دواترین كەس حەشر دەكرێت دوو شوانن لەهۆزی موزەینە ،مەڕەكانیان بەرخۆیان دەدەن بەرەو مەدینە بەدوای لەوەڕدا،ئیتر دەبینن شار چۆڵە،كاتێك دەگەنە (ثنية الوداع) لەسەر ڕوویان دەكەونە سەر زەوی .**

( الصحيحة ٦٨٣ )

---

[1] پێ دەچێت لەسەردەمی نەفامیدا بەو جۆرە قسانە مردوویان لاواندبێتەوە ،وەكو چۆن ئەمڕۆیش هەندێك قسەی لەو جۆرە دەكرێت ( وەرگێڕ )

[2] مەناوی دەڵێت : ئەگەر خۆر ڕاسپاردەی ( وەسیەتی ) كردبێت ،هیچ ناكۆكیش نییە لە نێوان ئەم فەرموودەو فەرموودەی خوای گەورە : لا تزر وازرة وزر اخرى { الانعام : ١٦٤ }

٧٨٨١- إذا جمع الله الأولين و الآخرين يوم القيامة يرفع لكل غادر لواء فقيل: هذه غدرة فلان ابن فلان.

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمر .

**٧٨٨١- کاتێك خوای گەورە هەموو خەڵکی سەرەتاکان و کۆتاکان کۆدەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ،بۆ هەموو ناپاکێك بەیداخێك بەرز دەکرێتەوە ،دەوترێت : ئەوە ناپاکی فلأنی کوڕی فلأنە .**

( الترغيب ٣٠٠٠ )

٧٨٨٢- إذا كان يوم القيامة أدنيت الشمس من العباد حتى تكون قيد ميل أو اثنين فتصهرهم الشمس فيكونون في العرق كقدر أعمالهم فمنهم من يأخذه إلى عقبيه و منهم من يأخذه إلى ركبتيه و منهم من يأخذه إلى حقويه و منهم من يلجمه إلجاما.

( صحيح ) ( حم ت ) عن المقداد .

**٧٨٨٢- لە ڕۆژی قیامەتدا خۆر نزیك دەکرێتەوە لە بەندەکان ،تاکو دەگاتە ئەندازە میلێك یان دوو میل ،خۆرەکە دەیانتوێنێتەوە ،بە گوێرەی کردەوەکانیان لە ئارەقدان ، کەسی وایان هەیە تاکو پاژنەیان ئارەق دای دەپۆشێت و ،هەندێکیان تاکو ئەژنۆیان و ، هەندێکیان تاکو ناوەڕاستی و ،هەندێکیشیان وەکو لەغاو کردن لە غاویان دەکات .**

( الصحيحة ١٣٨٢ )

٧٨٨٣- إذا كان يوم القيامة أعطى الله تعالى كل رجل من هذه الأمة رجلا من الكفار فيقال له: هذا فداؤك من النار.

( صحيح ) ( م ) عن أبي موسى .

**٧٨٨٣- لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە هەر پیاوێك لە بێباوەڕان دەداتە دەستی یە کێك لەم ئوممەتە و ، پێی دەفەرموێت : ئەوە فەزاوەگێڕی تۆیە ڕزگارانەتە لە ئاگر.**

( الصحيحة ١٣٨١ )

٧٨٨٤- إذا كان يوم القيامة بعث الله إلى كل مؤمن ملكا معه كافر فيقول الملك للمؤمن: يا مؤمن هاك هذا الكافر فهذا فداؤك من النار.

( صحيح ) ( طب الحاكم في الكنى ) عن أبي موسى .

**٧٨٨٤- خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بێباوەڕێك لە گەڵ فریشتەیەکدا دەنێرێت لای هەموو بڕوادارێك ،فریشتەکە بە بڕوادارەکە دەڵێت : ئەی بڕوادار ها ئەو بێباوەڕە ،ئەوە قەزاوەگێڕتە لە دۆزەخ .**

( الصحيحة ١٣٨١ )

٧٨٨٥- إن الجماء لتقتص من القرناء يوم القيامة.

( صحيح ) ( عم ) عن عثمان .

**٧٨٨٥- بەڕاستی ئاژەڵی کۆڵ تۆڵەی خۆی لە ئاژەڵی شاخدار وەردەگرێتەوە .**

( الصحيحة ١٥٨٨ )

٧٨٨٦- إن العرق يوم القيامة ليذهب في الأرض سبعين باعا و إنه ليبلغ إلى أفواه الناس أو إلى آذانهم.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة .

**٧٨٨٦- ئارەقی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو قیامەتدا حەفتا باڵ بەرز دەبێتەوە ،دەگاتە دەمی خەڵکی یان دەگاتە پەناگوێیان .**

٧٨٨٧- إن الله تعالى لا يظلم المؤمن حسنة يعطى عليها في الدنيا و يثاب عليها في الآخرة و أما الكافر فيطعم بحسناته في الدنيا حتى إذا أفضى إلى الآخرة لم تكن له حسنة يعطى بها خيرا.

( صحيح ) ( حم م ) عن أنس .

**٧٨٨٧- خوای گەورە ستەم لە بڕوادار ناکات لەسەر چاکەیەك لە دونیادا پێی دەبەخشرێت و ،،لە دواڕۆژدا پاداشت دەدرێتەوە لەسەری ،بەڵام بێباوەڕ بە چاکەکانی لە دونیادا خواردنی دەدرێتو ،کاتێکیش دەچێتە قیامەت هیچ چاکەییەکی نییە ، بەرانبەری پاداشتی پێبدرێت .**

( الصحيحة ٢٧٧٠ )

٧٨٨٨- إن الله تعالى يقول يوم القيامة: أين المتحابون لجلالي اليوم أظلهم في ظلي يوم لا ظل إلا ظلي.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة .

**٧٨٨٨- خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت : کوا ئەوانەی لە بەر مەزنی من یەکتریان خۆش دەویست ،ئەمڕۆ دەیان خەمە سایەی خۆم ،لە ڕۆژێکدا کە تەنها سایەو سێبەری من هەیە .**

( المشكاة ٥٠٠٦ )

٧٨٨٩- إن المتحابين بالله في ظل العرش.

( صحيح ) ( طب ) عن معاذ .

**٧٨٨٩- بەڕاستی ئەوانەی لە پێناو خوا یەکتریان خۆش دەوێت لە سایەی عەرشدان .**

( الترغيب ٣٠١٩ )

٧٨٩٠- إن المرد إلى الله إلى جنة أو نار خلود بلا موت و إقامة بلا ظعن.

( صحيح ) ( طب ) عن معاذ .

**٧٨٩٠- بەڕاستی گەڕانەوە بۆلای خوا یان بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخە ،مانەوەیە بە بێ مردن و ، جێگیر بوونە بە بێ بارکردن .**

( الصحيحة ١٦٦٨ )

٧٨٩١- إن أول ما يسأل عنه العبد يوم القيامة من النعيم أن يقال له: ألم نصح لك جسمك و نرويك من الماء البارد ؟.

( صحيح ) ( ت ك ) عن أبي هريرة .

**٧٨٩١- یەکەمین شت کە بەندە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاری لێ دەکرێت ،دەربارەی بەهرەمەندیە پێی دەوترێت : ئایا تەندروستی لاشەمان باش نەکردی و ، ئاوی ساردمان پێنەبەخشیت ؟**

( الصحيحة ٥٣٨ )

٧٨٩٢- إنه قد حضر من أبيك ما ليس الله تعالى بتارك منه أحدا لموافاة يوم القيامة

( صحيح ) ( حم خ ) عن أنس .

**٧٨٩٢- شتێك هاتووەت بە سەر باوکتدا ،[1] کە خوای گەورە کەسی لێ نابوێرێت ،بۆ ڕۆیشتن بەرەو قیامەت .**

( الصحيحة ١٧٣٨ )

٧٨٩٣- أول من يدعى يوم القيامة: آدم فتتراءى له ذريته فيقال: هذا أبوكم آدم فيقول: لبيك و سعديك فيقول: أخرج بعث جهنم من ذريتك: فيقول: يا رب كم أخرج ؟ فيقول: أخرج من كل مائة تسعة و تسعين قالوا: يا رسول الله إذا أخذ منا من كل مائة تسعة و تسعون فماذا يبقي منا ؟ قال: إن أمتي في الأمم كالشعرة البيضاء في الثور الأسود.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة .

**٧٨٩٣- يەكەمين كەس بانگ دەكريْت لە رِۆژى قيامەتدا ،ئادەمە ،نەوەكانى ديْنە پيْش چاوى و ،دەوتريْت : ئەوە ئادەمى باوكتانە ،ئەويش دەلْيْت : بە فەرمانت بەجيْيەو كامەرانى هەر لاى تۆيە ، پيْى دەفەرمويْت : نيْردەى نەوەكەت لەدۆزەخ دەربكە ،دەلْيْت خوايە چەند دەربكەم ؟ دەفەرمويْت : لە هەموو سەد كەس نەوەدو نۆ دەربهيْنە ، وتيان ئەى پيْغەمبەرى خوا ،ئەگەر لە هەموو سەد كەس نەوەدو نۆمان ليْ دەربچيْت چيمان ليْ دەميْنيْتەوە؟ فەرمووى : ئوممەتى من لە ئوممەتەكاندا وەكو مووى سپى يە لە گاى رِەشدا.**

( الصحيحة ٣٣٠٧ )

٧٨٩٤- أول من يكسى من الخلائق إبراهيم.

( صحيح ) ( البزار ) عن عائشة .

**٧٨٩٤- يەكەمين كەس لە دروستكراوەكان دادەپۆشريْت ئيبراهيمە .**

( الصحيحة ١١٢٩ )

٧٨٩٥- تكون الأرض يوم القيامة خبزة واحدة يتكفؤها الجبار بيده كما يتكفأ أحدكم خبزته في السفر نزلا لأهل الجنة.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي سعيد .

**٧٨٩٥- زەوى لە رِۆژى قيامەتدا وەكو يەك نانى ليْ ديْت ، پەروەردگار هەلْى دەگريْتەوە بەدەستى وەكو چۆن كەسيْك لە ئيْوە نانەكەى لە گەشتا هەلْدەگريْتەوە ،بۆ پيْشوازى لە بەهەشتيەكان .**

( الصحيحة ١٤٣٨ )

٧٨٩٦- تكون النسم طيرا تعلق بالشجر حتى إذا كان يوم القيامة دخلت كل نفس في جسدها

( صحيح ) ( طب ) عن أم هانئ .

**٧٨٩٦- گيان دەبيْتە بالْندەيەك خۆى هەلْدەواسيْت بە دارو درەختدا ،تاكو دەگاتە رِۆژى قيامەت هەموو گيانيْك دەچيْتە لاشەكەيەكەوە .**

( المشكاة ١٦٣١ )

٧٨٩٧- السلام عليكم دار قوم مؤمنين و إنا إن شاء الله بكم لاحقون وددت أنا قد رأينا إخواننا قالوا: أولسنا إخوانك ؟ قال: بل أنتم أصحابي و إخواننا الذين لم يأتوا بعد قالوا: كيف تعرف من لم يأت بعد من أمتك ؟ قال: أرأيت لو أن رجلا له خيل غر محجلة بين ظهري خيل دهم

بهم ألا يعرف خيله قالوا: بلى قال: فإنهم يأتون يوم القيامة غرا محجلين من الوضوء و أنا فرطهم على الحوض ألا ليذادن رجال عن حوضي كما يذاد البعير الضال أناديهم: ألا هلم ألا هلم فيقال: إنهم قد بدلوا بعدك فأقول: سحقا فسحقا فسحقا.

( صحيح ) ( مالك الشافعي حم م ن هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٨٩٧- سلاوتان لێبێت ماڵی کەسە خاوە باوەڕەکان ،ئێمەیش بەویستی خوای گەورە بەدواتاندا دێین ،خۆزگەم براکانمم دەبینی ،وتیان : ئایە ئێمە برات نیین ؟ فەرمووی بەڵکو ئێوە هاوەڵی منن ،براکانمان ئەوانەن کە هێشتا نەهاتوون ،وتیان : چۆن ئەوان دەناسی لە ناو ئوممەتەکەتدا کە هێشتا نەهاتوون ؟ فەرمووی : ئایا ئەگەر پیاوێك هەندێك ئەسپی هەبێت بەڵەك و ناوچەوان قەشان بن ،لە نێو هەندێ ئەسپی ڕەشدا ئایا نایانناسێتەوە ؟ وتیان : بەڵێ ، فەرمووی : ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا نێوچاوان و پەلەکانیان سپی یە ،بە بۆنەی دەست نوێژەوە ،من پێشیان دەکەوم لەسەر حەوزەکە ، بەڵی کەسانێك پاڵ دەنرێت وەکو وشتری ونبوو لەسەر حەوزەکەم دوور دەخرێنەوە ، بانگیان دەکەم : وەرن وەرن ئینجا ،دەوترێت : ئەوانە گۆڕان لە دوای تۆ ،منیش دەڵێم دورتریا نخەوە و دورتریا نخەوە .**

( ألارواء ٧٦٨ )

٧٨٩٨- لو أن رجلا يجر على وجهه من يوم ولد إلى يوم يموت هرما في مرضاة الله تعالى لحقره يوم القيامة.

( صحيح ) ( حم تخ طب ) عن عتبة بن عبد.

**٧٨٩٨- ئەگەر پیاوێك لەسەر ڕوومەتی ڕابکێشرێت لەو ڕۆژەوە لەدایك بووە ،تاکو بە پیری دەمرێت ،لە ڕەزامەندی خوای گەورە هەر بەکەمی دەزانێت .**

( الصحيحة ٤٤٦ )

٧٨٩٩- ليس شيء من الإنسان إلا يبلى إلا عظم واحد و هو عجب الذنب و منه يركب الخلق يوم القيامة.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٨٩٩- هەموو شتێك لەئادەمیزادا لەنێو دەچێت ،تەنها ئیسقانێك نەبێت پێی دەوترێت** ( عجب الذنب )**کیلێنچك**[1]**، لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەر لەوەوە دروست دەکرێت .**

( الترغيب ٣٥٧٤ )

---

[1] **لە خوارەوەی پشتە ( العصعص )**

٧٩٠٠- ما من الأنبياء من نبي إلا و قد أعطي من الآيات ما مثله آمن عليه البشر و إنما كان الذي أوتيته وحيا أوحاه الله إلي فأرجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٧٩٠٠- هەرچی پێغەمبەرێك هەیە لە پێغەمبەران هەندێ بەڵگەی[1] پێبەخشراوە ،بۆ ئەوەی خەڵکی باوەڕ بهێنن ،ئەوەشی بە من بەخشراوە وەحیەکەی خوای گەورە بۆی ناردووم ،بۆیە ئومێدەوارم لە ڕۆژی قیامەتدا لە هەموویان شوێنکەوتووم زۆر تر بێت .**

( المشكاة ٥٧٤٦ )

٧٩٠١- من حوسب عذب.

( صحيح ) ( ت الضياء ) عن أنس.

**٧٩٠١- هەرکەس لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت سزا دەدرێت .**

( صحيحة الترمذي ٣٣٣٨ )

٧٩٠٢- من حوسب يوم القيامة عذب قالت عائشة: أو ليس يقول الله: ( فسوف يحاسب حسابا يسيرا ؟ قال: ليس ذلك بالحساب إنما ذلك العرض و لكن من نوقش الحساب يهلك ) .

( صحيح ) ( حم ق ت ) عن عائشة.

**٧٩٠٢- هەرکەس لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت سزا دەدرێت ،عائیشە فەرمووی : ئایا خوای گەورە نافەرموێت:" فسوف يحاسب حسابا يسيرا "{ الانشقاق:٨} دەفەرموێت : ئەوە لێپرسینەوە نیە بەڵکو بەرمو ڕوو کردنەوەیە ،بەڵام هەرکەس لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت تیا دەچێت .**

( المشكاة ٥٥٤٩ )

٧٩٠٣- من سره أن ينظر إلى يوم القيامة كأنه رأى عين فليقرأ ( إذا الشمس كورت ) و ( إذا السماء انفطرت ) و ( إذا السماء انشقت ) ) .

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن ابن عمر.

**٧٩٠٣- هەرکەس پێی خۆشە تەماشای ڕۆژی قیامەت بکات وەکو ئەوەی بە چاوی خۆی ببینێت ،با ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە**( إذا الشمس كورت ) و ( إذا الشمس أنقطرت ) و ( إذا السماء أنشقت ).

( الصحيحة ١٠٨١ )

---

[1] **موعجیزە**

٧٩٠٤- يجمع الله الناس يوم القيامة في صعيد واحد ثم يطلع عليهم رب العالمين فيقول: ألا يتبع كل إنسان ما كان يعبد ؟ فيمثل لصاحب الصليب صليبه و لصاحب التصاوير تصاويره و لصاحب النار ناره فيتبعون ما كانوا يعبدون و يبقى المسلمون فيطلع عليهم رب العالمين فيقول: ألا تتبعون الناس ؟ فيقولون: نعوذ بالله منك نعوذ بالله منك الله ربنا و هذا مكاننا حتى نرى ربنا و هو يأمرهم و يثبتهم قالوا: و هل نراه يا رسول الله ؟ قال: و هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر ؟ قالوا: لا قال: فإنكم لا تضارون في رؤيته تلك الساعة ثم يتوارى ثم يطلع فيعرفهم نفسه ثم يقول: أنا ربكم فاتبعوني فيقوم المسلمون و يوضع الصراط فيمر عليه مثل جياد الخيل و الركاب و قولهم عليه: سلم سلم و يبقى أهل النار فيطرح فيها منهم فوج ثم يقال: هل امتلأت؟ فتقول: هل من مزيد ؟ ثم يطرح فيها فوج فيقال: هل امتلأت ؟ فتقول: هل من مزيد؟ حتى إذا أوعبوا فيها وضع الرحمن قدمه فيها و أزوى بعضها إلى بعض ثم قال: قط ؟ قالت: قط قط فإذا أدخل الله أهل الجنة الجنة و أهل النار النار أتي بالموت ملببا فيوقف على السور الذي بين أهل الجنة و أهل النار ثم يقال: يا أهل الجنة ! فيطلعون خائفين ثم يقال: يا أهل النار ! فيطلعون مستبشرين يرجون الشفاعة فيقال لأهل الجنة و أهل النار: هل تعرفون هذا ؟ فيقول هؤلاء و هؤلاء: قد عرفناه هو الموت الذي وكل بنا فيضجع فيذبح ذبحا على السور ثم يقال: يا أهل الجنة! خلود لا موت و يا أهل النار ! خلود لا موت.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٧٩٠٤- خواى گەورە خەڵكى كۆدەكاتەوە لەيەك دەشتاييدا لە رۆژى قيامەتدا ،ئينجا تەماشايان دەكات و دەفەرمويّت : ئاگاداربن با هەموو كەسيّك شويّنى پەرستراوەكەى بكەويّت ؟ ئيتر خاچ پەرست خاچەكەى بۆ ويّنە دەكيّشريّت و خاوەن پەيكەرو ويّنەكان ويّنەى ئەو پەيكەرانەيان بۆ دەكيّشريّت و ئاگر پەرستيش ئاگرەكەى بۆ ويّنە دەكيّشريّت و پيّش هەمويان ،شويّنى پەرستراوەكانيان دەكەون و موسڵمانان دەميّننەوە ،خواى گەورە تەماشايان دەكات و دەفەرموويّت : ئايا شويّن خەڵكى ناكەون ؟ دەڵيّن : پەنا بەخوا دەگرين ،پەنا دەگرينە خوا ، خواى گەورە پەروەردگارمانەو ئەمە جيّگامانە تا پەروەردگارمان دەبينين ئەويش فەرمانيان پيّدەكات و جيّگيريان دەكات ،دەڵيّن : ئايا ئەوە دەبينين ئەى پيّغەمبەرى خوا ؟ دەفەرمويّت : ئايا دوو دڵ دەبن لە بينينى مانگ لەشەوى چواردەدا ؟ وتيان : نەخيّر ،فەرمووى :هەر ئاوا ئيّوەش دوودڵ و ڕاڕا نابن لە**

**بینینی لەو کاتەدا ،ئینجا دیار نامێنێت و ،پاشان دەردەکەوێتەوە و خۆیان پێ دەناسێنێت ،ئینجا دەفەرموێت : من پەروەردگاری ئێوەم شوێنم بکەون ،ئیتر موسڵمانان هەڵدەستن و پردی ( صراط ) لێدەدرێت ،ئیتر تێدەپەڕن لەسەری وەکو ئەسپی خێرا و کاروانی پەلە ،قسەشیان لەسەربردەکە ئەوەیە دەڵێن : خوایە سەلامەتمان بکە سەلامەتمان بکە ،بابای دۆزەخی دەمێننەوە ،جا کۆمەڵێکیان فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە و ،ئینجا دەوترێت : ئایا پڕ بووی ؟ ئینجا دەڵێت : ئایا زیاتر هەیە ؟ ئینجا کۆمەڵێکی تری تێ فڕێ دەدرێت و ،دەوترێت : ئایا پڕ بوویت ؟ ئەویش دەڵێت : ئایا زیاتر هەیە ،تائەو کاتەی هەمویان کۆدەبنەوە لە دۆزەخدا پەروەردگار پێی دەخاتە ناوی ،ئەویش دێتە یەك ،ئینجا دەڵێت هەرگیز ؟دەڵێت هەرگیز هەرگیز ،جا کاتێك خوای گەورە خەڵکی بەهەشت دەخاتە بەهەشتەوە و ،خەڵکی دۆزەخ دەخاتە دۆزەخەوە ، مردن کێش دەکرێ و دەهێنرێت لەسەر دیواری نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەوستێنرێت ،ئینجا دەوترێت : ئەی ئەهلی بەهەشت ئەوانیش بە ترسەوە دەڕوانن ،ئینجا دەوترێت : ئەی ئەهلی دۆزەخ ! ئەوانیش بە هیوای شەفاعەتەوە دەڕوانن ،ئینجا بە هەردوو لایان دەوترێت : ئەوە دەناسن ؟ هەردوولایان دەڵێن دەیناسین ئەوە مردنە کە پێی سپێردراوین ،ئیتر ڕادەکێشرێت لەسەر دیوارەکە سەر دەبڕێت ،ئینجا دەوترێت : ئەی ئەهلی بەهەشت ! ئیتر مانەوەی بێ مردنە ! ئەی ئەهلی دۆزەخ ئیتر مانەوەی بێ مردنە .**

( الطحاوية ٤١٢ )

٧٩٠٥- ولد آدم كلهم تحت لوائي يوم القيامة و أنا أول من يفتح له باب الجنة.

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن حذيفة.

**٧٩٠٥- ئادەمیزادەکان هەموویان لەژێر بەیداخی مندان ،منیش یەکەم کەسم دەرگای بەهەشتم بۆ دەکرێتەوە .**

( الصحيحة ٢٤١١ )

٧٩٠٦- لا تخيروا بين الأنبياء فإن الناس يصعقون يوم القيامة فأكون أول من تنشق عنه الأرض فإذا موسى آخذ بقائمة من قوائم العرش فلا أدري كان فيمن صعق أم حوسب بصعقته الأولى ؟.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي سعيد.

**٧٩٠٦- هەڵبژاردن مەکەن لە نێوان پێغەمبەراندا ،چونکە خەڵکی دەبورێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەمرن و ،من یەکەم کەسم زەوی گۆڕەکەم بۆ لەت دەبێت ،دەبینم موسا دەستی گرتووە بە پایەیەك لە پایەکانی عەرشەوە ،ئیتر نازانم لەوانە بوو کە بوورانەوە ،یان یەکەم بوورانەوەی[1] بۆ ژمێردرا ؟**

( الطحاوية ١٠٨ )

٧٩٠٧- لا تخيروني على موسى فإن الناس يصعقون يوم القيامة فأصعق معهم فأكون أول من يفيق فإذا موسى باطش بجانب العرش فلا أدري أكان فيمن صعق فأفاق قبلي أو كان ممن استثنى الله ؟.

( صحيح ) ( حم ق د هـ ) عن أبي هريرة.

**٧٩٠٧- من هەڵمەبژێرن بە سەر موسادا ، چونکە خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بیهۆش دەکەون و ،منیش لەگەڵیان بیهۆش دەکەوم ، جا من یەکەم کەسم هۆشم دێتەوە ،دەبینم موسا ڕاوەستاوە لە تەنیش عەرشەوە ،ئیتر نازانم لەوانە بوو کە بیهۆش کەوتن و ، پێش من ئاگادار هۆشی هاتۆتەوە (( زیندوو بۆتەوە )) ،یان خوای گەورە ئەوی جیا کردەوە .**

( المشكاة ٥٧٠٨ )

٧٩٠٨- لا تزول قدما ابن آدم يوم القيامة من عند ربه حتى يسأل عن خمس: عن عمره فيم أفناه ؟ و عن شبابه فيم أبلاه ؟ و عن ماله من أين اكتسبه ؟ و فيم أنفقه ؟ و ماذا عمل فيما علم ؟.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن مسعود.

**٧٩٠٨- ئادەمیزاد پێ نابزبۆێ لە ڕۆژی قیامەتدا تاکو دەربارەی پێنج شت پرسیاری لێ نەکرێت : دەربارەی تەمەنی لەچی دا تەواوی کردووە و دەربارەی گەنجیەتی لەچیدا بەسەری برد ،زانستی چی پێکردووە ،ماڵەکەی لە کوێ بەدەستی هێناوە و ،لە چی دا خەرجی کردووە ؟ لەوەیش کە زانیویەتی چی کارێکی پێ کردووە .**

( الصحيحة ٩٤٦ )

٧٩٠٩- لا تزول قدما عبد حتى يسأل عن أربع: عن عمره فيم أفناه و عن علمه ما فعل فيه و عن ماله من أين اكتسبه و فيم أنفقه و عن جسمه فيم أبلاه.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي برزة.

---

[1] واتە بورانەوەی کێوی طور ـ واتە :/ بورانەوە یان مردنەکەی کێوی گوری بۆ حساب کردووە و جاری تر نە مردۆتەوە و لەومو دوا هەر زیندوو بوو هەتا قیامەت .

**٧٩٠٩- بەند قاچی نابزێوێتاكو پرسیاری چوار شتی لیٚ نەكرێت : دەربارەی تەمەنی لەچی دا لەناوی بردووە و دەربارەی ،زانستەكەی چی كارێكی پیٚ كردووە و دەربارەی ، ماڵەكەی لە كویٚ بەدەستی هێناوە و ،لە چی دا خەرجی كردووە ؟ دەربارەی لاشەشی لە چیدا بەسەری برد .**

( الصحيحة ٩٤٦ )

٧٩١٠- يحشر الناس على ثلاث طرائق: راغبين راهبين و اثنان على بعير و ثلاثة على بعير و أربعة على بعير و عشرة على بعير و يحشر بقيتهم النار لتقيل معهم حيث قالوا و تبيت معهم حيث باتوا و تصبح معهم حيث أصبحوا و تمسي معهم حيث أمسوا.

( صحيح ) ( ق ن ) عن أبي هريرة.

**٧٩١٠- خەڵكی بە سیٚ شێوە كۆ دەكرێنەوە : بە خۆشحاڵی و ،بە زۆر ، دوو كەس لەسەر وشترێك و ،سیٚ كەس لەسەر وشترێك و ،چوار كەس لەسەر وشترێك و ،دەكەس لەسەر وشترێك ،ئەو دوانەیش ئاگر كۆیان دەكاتەوە لەگەڵیان دەمێنێتەوە لەهەركویٚ بمێننەوە بەیانی و ئێوارە .**

( الصحيحة ٣٣٩٥ )

٧٩١١- يحشر الناس على نياتهم.

( صحيح ) ( هـ ) عن جابر.

**٧٩١١- خەڵكی لەسەر نیەتەكانیان حەشر دەكرێن .**

( صحيح ابن ماجة ٤٢٣٠ )

٧٩١٢- يحشر الناس يوم القيامة حفاة عراة غرلا الأمر أشد من أن ينظر بعضهم إلى بعض.

( صحيح ) ( م ن هـ ) عن عائشة.

**٧٩١٢- خەڵكی لە ڕۆژی قیامەتدا حەشر دەكرێن ،بە پێخاوسی و ڕووتی و خەتەنە نەكراوی ،مەسەلەكەش لەوە گەورەترە كەس تەماشای كەس بكات .**

( المشكاة ٥٥٣٦ )

٧٩١٣-يحشر الناس يوم القيامة على أرض بيضاء عفراء كقرصة النقي ليس فيها معلم لأحد.

( صحيح ) ( ق ) عن سهل بن سعد.

**٧٩١٣- خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوە لەسەر خاکێکی سپی وەکو ئارد ،هیچ نیشانەی کەسی تیادا نیە .**

( المشكاة ٥٥٣٢ )

٧٩١٤- يؤتى بالعبد يوم القيامة فيقال: له:ألم أجعل لك سمعا وبصرا ومالا و ولدا ، وسخرت لك الأنعام و الحرث ، وتركتك ترأس وتربع فكنت تظن أنك ملاقي يومك هذا؟ فيقول : لا . فيقول له: اليوم أنساك كما نسيتني.

( صحيح ) (ت) عن أبي هريرة وأبي سعيد.

**٧٩١٤- بەندە لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێت و پێی دەوترێت : ئایا گوێ و چاوو ماڵ و منالم پێ نەبەخشیت و ،مەڕو ماڵات و کێلگەم بۆ نەهێنایتە ژێر بار و ،وازیشم لێ نەهێنای سەرۆکایەتی بکەیت و ،چوار یەکی دەستکەوت[1] ببەیت ،تۆیش دەتزانی تووشی ئەم ڕۆژە دەبیت ،ئەویش دەڵێت : نەخێر ،ئەوسا پێی دەفەرموێت : ئەمڕۆ لە بیرت دەکەم وەکو چۆن لە بیرت کردم .**

( السنة ٨٣٢ )

٧٩١٥- يخرج عنق[2] من النار يوم القيامة له عينان يبصران و أذنان يسمعان و لسان ينطق يقول: إني وكلت بثلاثة: بكل جبار عنيد و بكل من دعا مع الله إلها آخر و بالمصورين.

( صحيح ) ( حم ت ) عن أبي هريرة.

**٧٩١٥- پارچەیەك لە دۆزەخەوە دەردەچێت ،دوو چاوی هەیە پێیان دەبینێت و ،دوو گوێی هەیە پێیان دەبیستێت و ،زمانیشی قسەدەکات ،دەڵێ : بەڕاستی من سێ شتم پێ سپێردراوە : هەموو ستەم کارێکی سەر کەش و ،هەموو کەسێك لەگەڵ خوای گەورە هاوبەش پەیدابکات و وێنەگرانیش .**

( الصحيحة ٥١٢ )

٧٩١٦- يطوي الله السموات يوم القيامة ثم يأخذهن بيده اليمنى ثم يقول: أنا الملك أين الجبارون ؟ أين المتكبرون ؟ ثم يطوي الأرضين ثم يأخذهن بشماله ثم يقول: أنا الملك أين الجبارون ؟ أين المتكبرون؟

( صحيح ) ( م د ) عن ابن عمر

---

[1] سەرۆکی هۆزو عەشیرت چواریەکی ماڵی خەڵکی پێ دەدرا و مافی خۆی بوو لێیان وەرگرێت . السراج المنير ج٢ ص ١٢٦٨

[2] عُنُق : واتە پارچەیەك بۆ نمونە (( الفلان عُنُق من الخير )) اي قطعة ، النهاية في غريب الحديث و الأثر ج٢ ص ٢٦٣ ط٣ ابن الثير .

**٧٩١٦- خواى گەورە ئاسمانەكان لوول دەدات لە رۆژى قيامەتدا و ،ئينجا بە دەستى راستى دەيانگريت و دەفەرمويت : من پادشاى بە دەسەلاتم كوا ستەم كارەكان كوا ؟خۆ سەركەشەكان ؟ ئينجا زەويەكان لوول دەدات و ،بە دەستى چەپ دەيانگريت ...ئينجا دەفەرمويت : من پادشاى بە دەسەلاتم ؟كوا دەسەلاتدارە ستەمكارەكان كوا خۆ بەگەورە زانەكان ؟**

( السنة ٥٤٨ )

٧٩١٧- يأخذ الجبار سماواته و أرضه بيده ثم يقول أنا الجبار أنا الملك أين الجبارون ؟ أين المتكبرون ؟.

( صحيح ) ( هـ ) عن ابن عمر.

**٧٩١٧- خواى بالادەست ئاسمانەكانى و زەويەكەى بەدەستى دەگريت و ،دەفەرمويت : من خاوەن دەسەلاتم،من پادشام ،لە كوين دەسەلاتدارەكان ؟لە كوين خۆبە گەورە زانەكان؟**

( صحيح ابن ماجة ١٩٨ )

٧٩١٨- يعرق الناس يوم القيامة حتى يذهب عرقهم في الأرض سبعين ذراعا يلجمهم حتى يبلغ آذانهم.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة.

**٧٩١٨- خەلكى ئارەق دەكەنەوە لە رۆژى قيامەتدا ،تاكو ئارەقەكەيان حەفتا بال دەچيت بە زەويدا ،لغاويان دەكات تاكو دەچى تە لاى گوييان .**

( المشكاة ٥٥٣٩ )

٧٩١٩- يقال للرجل من أهل النار يوم القيامة: أرأيت لو كان لك ما على الأرض من شيء أكنت مفتديا به ؟ فيقول: نعم ؟ فيقول الله: كذبت قد أردت منك أهون من ذلك قد أخذت عليك في ظهر آدم أن لا تشرك بي شيئا فأبيت إلا أن تشرك.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أنس.

**٧٩١٩- لە رۆژى قيامەتدا بە پياويكى خەلكى دۆزەخ دەوتريت: ئايا ئەگەر هەرچى لەسەر زەويدا هەيە مالى تۆ بووايە دەتكردە فيداى خۆت ؟ دەليت : بەلى ،خواى گەورە دەفەرمويت : درۆت كرد ،لەوە كەمترم ليت ويست ،لە بربرەى پشتى ئادەمەوە داوام لى كردى هاوتام بۆ پەيدا نەكەيت و ،بەلام هەر بەگويت نەكردم .**

( السنة ٩٩ )

٧٩٢٠- يقبض الله الأرض يوم القيامة و يطوي السموات بيمينه ثم يقول: أنا الملك أين ملوك الأرض ؟.

( صحيح ) ( ق ن هـ ) عن أبي هريرة ( خ ) عن ابن عمر.

**٧٩٢٠- خواى گەورە زەوى دەگرێت و ،ئاسمانەکان لوول دەدات بە دەستى ڕاستى لە ڕۆژى قیامەتدا و ،دەفەرموێت : من پادشام لە کوێن پادشایانى سەر زەوى .**

( السنة ٥٤٨ )

٧٩٢١- يلقى إبراهيم أباه آزر يوم القيامة و على وجه آزر قترة و غبرة فيقول له إبراهيم: ألم أقل لك لا تعصني ؟ فيقول أبوه: فاليوم لا أعصيك فيقول إبراهيم: يا رب ! إنك وعدتني أن لا تخزيني يوم يبعثون و أي خزي أخزى من أبي الأبعد ؟ فيقول الله: إني حرمت الجنة على الكافرين فيقال: يا إبراهيم ! انظر ما بين رجليك ! فينظر فإذا هو بذيخ ملتطخ فيؤخذ بقوائمه فيلقى في النار.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة.

**٧٩٢١- ئیبراهیم ڕوو بەڕووى ئازەرى باوکى دەبێتەوە لە ڕۆژى قیامەتدا ،لە ناڕەحەتى و پەشێویدایە ،ئیبراهیم پێى دەڵێت : ئایا پێم نەوتى لە قسەم دەرمەچۆ ؟باوکى دەڵێت : باشە ئەمڕۆ لە قسەت دەرناچم ،ئیبراهیم دەڵێت : ئەى پەروەردگار تۆ بەڵێنت پێدام ڕوو زەردم نەکەیت لە ڕۆژى زیندوو بوونەوەدا ،چى بێت لەوە ڕوو زەردى تر باوکم لە میهرەبانیت دوور خرێتەوە ؟ خواى گەورە دەفەرموێت : من بەهەشتم لەسەر بێباوەڕان قەدەغەکردووە ،ئینجا دەوترێت : ئەى ئیبراهیم ! بڕوانە نێوان هەردوو قاچت !ئەویش تەماشا دەکات کەمتیارێکە لە نێو خوێنى خۆیدا ،ئیتر پەلەکانى دەگیرێن و فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە .**

( المشكاة ٥٥٣٨ )

٧٩٢٢- يوضع الصراط بين ظهراني جهنم عليه حسك كحسك السعدان ثم يستجيز الناس فناج مسلم و مخدوش به ثم ناج و محتبس به و منكوس فيها

( صحيح ) ( حم هـ حب ك ) عن أبي سعيد.

**٧٩٢٢- پردى ( صرط ) دادەبەسترێت لە سەر دۆزەخ دڕکى لەسەرە لە وێنەى دڕکى سەعدان (( دڕکى دار خورما )) ،ئینجا خەڵکى تێپەڕدەبن ،لێیان دەردەچێت بە بێ وەى ، لێشیان دەردەچێت بە بریندارى ،ئینجا هەندێکى تر ڕزگاریان دەبێت و ،هەندێك گیر دەدرێن و ،هەندێك دەکەونە دۆزەخەوە .**

( صحيح ابن ماجة ٤٢٨٠ )

٧٩٢٣- يوم القيامة على المؤمنين كقدر ما بين الظهر و العصر.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة.

**٧٩٢٣- ڕۆژی قیامەت لەسەر بڕواداران ،وەکو ماوەی نێوان نیوەڕۆو عەسرە .**

( الصحيحة ٢٤٥٦ )

٧٩٢٤- أربعة يحتجون يوم القيامة: رجل أصم لا يسمع شيئا و رجل أحمق و رجل هرم و رجل مات في فترة: فأما الأصم فيقول: رب لقد جاء الإسلام و ما أسمع شيئا و أما الأحمق فيقول: رب جاء الإسلام و ما أعقل شيئا و الصبيان يحذفونني بالبعر و أما الهرم فيقول: رب لقد جاء الإسلام و ما أعقل شيئا و أما الذي مات في الفترة فيقول: رب ما أتاني لك رسول فيأخذ مواثيقهم ليطيعنه فيرسل إليهم أن ادخلوا النار فمن دخلها كانت عليه بردا و سلاما و من لم يدخلها سحب إليها.

( صحيح ) ( حم حب ) عن الأسود بن سريع وأبي هريرة .

**٧٩٢٤- چوار کەس بەڵگەیان هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا : پیاوێکی کەڕ هیچ نابیستێ و ، پیاوێکی گەمژەو ، پیاوێکی پیرو ، پیاوێك لە (فترة) و سەرگەردانیدا ژیابێت ،کەڕەکە دەڵێت : پەروەردگارم ئیسلام هات و هیچم نەدەبیست،گەمژەکەش دەڵێت : پەروەردگارم ئیسلام و هات و هیچ تێنەدەگەیشتم،منداڵەکان پشقلیان تێدەگرتم ، پیرەکەش دەڵێت : پەروەردگارم ئیسلام هات و هیچ تێنەدەگەیشتم ،ئەو کەسەش کە لەو فەترە دا ژیاوە دەڵێت : ئەی پەروەردگارم هیچ پێغەمبەرێك لەلای تۆوە نەهاتووە بۆلای من ،ئیتر پەیمانیان لێ وەردەگرێت کە گوێڕایەڵی بکەن ،ئینجا دەنێرێت بە دوایاندا کە بچنە دۆزەخەوە ،جا ئەوەیان کە دەچێتە دۆزەخەوە دەبێتە ساردی و سەلامەتی بۆی ،ئەوەشی کە ناچێتە ناوی ڕادەکێشرێت بۆ ناوی .**

( الصحيحة ١٤٣٤ )

٧٩٢٥- بينما أنا نائم إذا زمرة حتى إذا عرفتهم خرج رجل من بيني و بينهم فقال: هلم قلت: أين ؟ قال: إلى النار و الله قلت: ما شأنهم ؟ قال: إنهم ارتدوا بعدك على أدبارهم القهقرى ثم إذا زمرة حتى إذا عرفتهم خرج رجل من بيني و بينهم فقال: هلم قلت: أين ؟ قال: إلى النار قلت: ما شأنهم ؟ قال: إنهم ارتدوا بعدك على أدبارهم القهقرى فلا أراه يخلص منهم إلا مثل همل النعم.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة .

**٧٩٢٥- لە خەونمدا تاقمێكم بینی كاتێك كە ناسیمن ، پیاوێك لە نێوان من و ئەواندا دەرچوو و ،وتی : وەرە ،وتم : بۆ كوێ ؟ وتی : بۆ دۆزەخ ،وتم : چی یە مەسەلەكەیان ؟ وتی : ئەوانە لە پاش تۆ پاشەوپاش هەڵگەڕانەوە ،ئینجا تاقمێكی ترم بینی و ناسیمن ، پیاوێك لە نێوان من و ئەواندا دەرچوو ،وتی وەرە ،وتم :بۆ كوێ ؟ وتی : بەرەو دۆزەخ ،وتم : چی یە مەسەلەكە یان ؟ وتی : ئەوانە لە پاش تۆ پاشەوپاش هەڵگەڕانەوە ،جا وانازانم كەسانێكی كەم نەبێت لە وانە ڕزگاریان دەبێت مەگەر وەكو ئاژەڵی لاكەوتە[1].**

( الترغيب ٢١٠٧ )

٧٩٢٦- يرد الناس النار ثم يصدرون عنها بأعمالهم فأولهم كلمح البصر ثم كمر الريح ثم كحضر الفرس ثم كالراكب في رحله ثم كشد الرجل ثم كمشيه.

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن ابن مسعود.

**٧٩٢٦- خەڵكی دەچنە دۆزەخەوە ،دوای بە پێی كردەوەكانیان لێی دەردەچن ،جا یەكەمیان وەكو چاو تروكان و ،ئینجا وەكو بای توندو ،ئینجا وەكو ئەسپی تیژڕەو ، ئینجا وەكو سواری نێو كاروان ،ئینجا وەكو پەلە كردنی پیاو لە ڕاكردندا و ،ئینجا وەكو پیادە .**

( الصحيحة ٣١١ )

٧٩٢٧- إذا أراد الله بقوم عذابا أصاب العذاب من كان فيهم ثم بعثوا على أعمالهم

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمر .

**٧٩٢٧- ئەگەر خوای گەورە بیەوێت سزای كەسانێك بدات ،سزای هەموویان دەدات و ، دواتر لەسەر نییەتەكانیان زیندوو دەكرێتەوە .**

( الصحيحة ١٦٣٢ )

٧٩٢٨- إذا ظهر السوء في الأرض أنزل الله بأسه بأهل الأرض و إن كان فيهم قوم صالحون يصيبهم ما أصاب الناس ثم يرجعون إلى رحمة الله و مغفرته

( صحيح ) ( طب حل ) عن أم سلمة .

---

**[1] ( همل النعم ) واتە ئاژەڵێك لە لەوەڕگەدا بە تەنیا بەجێ بهێڵرێت بۆ ئەوەی لەوەڕ بخوات بەبێ شوان . قاموسی ڕستە ب٤ ل ١٨٨٢ .**

**٧٩٢٨- کاتێك خراپە لەسەر زەویدا سەرهەڵدەدات ، خوای گەورە سزای خۆی دەنێرێت بۆ سەر زەوی خەڵکی ،هەرچەندە کەسانی پیاو چاکیشیان تێدا بێت ،هەر سزایەك نۆشی خەڵکی دەبێت توشی ئەوانیش دەبێت ئینجا دەگەڕێنەوە لای میهرەبانی و لێخۆش بوونی خوای گەورە .**

( الصحيحة ١٣٧٢ )

٧٩٢٩- إذا كان أجل أحدكم بأرض أتى له حاجة إليها فإذا بلغ أقصى أثره قبضه الله إليه فتقول الأرض يوم القيامة رب هذا ما استودعتني.

( صحيح ) ( هـ الحكيم ك ) عن ابن مسعود .

**٧٩٢٩- کاتێك ئەجەلی کەسێکتان دەکەوێتە جێگایەکەوە ،کارێکی دەکەوێتە ئەو جێگایە ،جا کاتێك دەگاتە تەواو بوونی کارەکەی دەمرێت ،زەویش لە ڕۆژی قیامەتدا دەڵێت : پەروەردگارم ئەوەتا سپاردەکەت کە پێت سپاردم**

( الصحيحة ١٢٢٢ )

٧٩٣٠-إن الذي أمشاهم على أرجلهم في الدنيا قادر على أن يمشيهم على وجوههم يوم القيامة.

( صحيح ) ( حم ق ن ) عن أنس .

**٧٩٣٠- ئەوەی لەسەر قاچیان پیادەی کردن لە دونیادا ،خاوەن توانایە کە لەسەر ڕوومەتیان لە ڕۆژی قیامەتدا پیادەیان بکات.**

٧٩٣١- إن الله تعالى إذا أنزل سطواته على أهل نقمته فوافت آجال قوم صالحين فأهلكوا بهلاكهم ثم يبعثون على نياتهم و أعمالهم.

( صحيح ) ( هب ) عن عائشة .

**٧٩٣١- خوای گەورە کاتێك زەبرو زەنگی دادەبەزێنێتە سەر ئەوانەی قینی خوایان لەسەرە و ،هەندێ پیاو چاکانیش بەهۆی تیاچوونی ئەوان تیا دەچن ،ئینجا لەسەر نیەتەکان و کردەوەکانیان زیندوو دەکرێنەوە .**

( الصحيحة ١٦٢٢ )

٧٩٣٢- إن الميت يبعث في ثيابه التي يموت فيها.

( صحيح ) ( ك هق ) عن أبي سعيد .

**٧٩٣٢- مردوو لەو پۆشاکەدا زیندوو دەکرێتەوە کە تیایدا مردووە .**

( الصحيحة ١٣٨١ )

٧٩٣٣- إن هذه الأمة أمة مرحومة عذابها بأيديها فإذا كان يوم القيامة دفع إلى كل رجل من المسلمين رجل من المشركين فيقال: هذا فداؤك من النار.

( صحيح ) ( هـ ) عن أنس .

**٧٩٣٣- ئەم ئوممەتە ئوممەتێكە میهرەبانی لەگەڵدا كراوە ،سزای بەدەستی خۆیەتی جا كاتێك ڕۆژی قیامەت هەر دێت پیاوێكی بت پەرست دەدرێتە دەستی پیاوێكی موسڵمان و پێی دەوترێت : ئەو فیداتە لە دۆزەخ .**

( الصحيحة ١٣٨١ )

٧٩٣٤- إنكم تحشرون رجالا و ركبانا و تجرون على وجوهكم هاهنا - و أومأ بيده نحو الشام -.

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن معاوية بن حيدة .

**٧٩٣٤- ئێوە حەشر دەكرێن كۆدەكرێنەوە بە پیادەو بە سواری لەسەر ڕووخسارتان ڕادەكێشرێن ،ئالە وێ –ئاماژەی كرد بۆلای شام -**

( فضائل الشام ١٣ )

٧٩٣٥- إنما نسمة المؤمن طائر يعلق في شجر الجنة حتى يبعثه الله إلى جسده يوم يبعثه.

( صحيح ) ( مالك حم ن هـ حب ) عن كعب بن مالك .

**٧٩٣٥- گیانی بڕوادار باڵندەیەكە بە درەختی بەهەشتەوە دەنیشێتەوە تاكو خوای گەورە دەینێرێتەوە نێو لاشەكەی لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( الصحيحة ٩٩٥ )

٧٩٣٦- إنما يبعث الناس على نياتهم.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة .

**٧٩٣٦- بە ڕاستی خەڵكی لەسەر نییەتەكانیان زیندوو دەكرێنەوە .**

( الترغيب ١٣ )

٧٩٣٧- إنه ليأتي الرجل العظيم السمين يوم القيامة لا يزن عند الله جناح بعوضة.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة .

**٧٩٣٧- بەڕاستی پیاوی قەڵەوی زەبەلاح لە ڕۆژی قیامەتدا دێت كێشی باڵە مێشوولەیەكی نییە لای خوا .**

( الصحيحة ٣٥٨١ )

٧٩٣٨- إنهم يبعثون على نياتهم.

( صحيح ) ( ت هـ ) عن أم سلمة .

**٧٩٣٨- بێگومان ئەوانە لەسەر نیەتەكانیان زیندوو دەكرێنەوە .**

( الترغيب ١٣ )

٧٩٣٩- تدنوا الشمس يوم القيامة من الخلق حتى تكون منهم كمقدار ميل فيكون الناس على قدر أعمالهم في العرق فمنهم من يكون إلى كعبيه و منهم من يكون إلى ركبتيه و منهم من يكون إلى حقويه و منهم من يلجمه العرق إلجاما.

( صحيح ) ( م ) عن المقداد بن الأسود .

**٧٩٣٩- خۆر لە ڕۆژی قیامەتدا لەخەڵكی نزیك دەبێتەوە تاكو ئەوەندەی دوو میل نزیك دەبێتەوە لێیان ،خەڵكیش بە گوێرەی كردەوەكانیان عارەق دەكەنەوە ،هەندێكیان تاكو پاژنەیان ،هەندێكیان تاكو ئەژنۆو ،هەندێكیان دەگاتە پشتێنەیان و ،هەندێكیان نگرۆی ئارەق دەبن وەكو لغاو لغاویان دەكات .**

( الصحيحة ١٣٨٢ )

٧٩٤٠- صاحب الصور واضع الصور على فيه منذ خلق ينتظر متى يؤمر أن ينفخ فيه فينفخ.

( صحيح ) ( خط ) عن البراء.

**٧٩٤٠- ئیسرافیل كەڕەناكەی خستووەتە سەر دەمی لەو ڕۆژەوە كە دروست كراوە چاوەڕوانەكەی فەرمانی پێبكرێت و فووی پیابكات[1].**

( الصحيحة ١٠٧٩ )

٧٩٤١- الصور قرن ينفخ فيه .

( صحيح ) ( حم د ت ك ) عن ابن عمرو.

**٧٩٤١- كەڕەنا شاخێكە فووی پیا دەكرێت .**

( الصحيحة ١٠٨٠ )

٧٩٤٢- كل ابن آدم يأكله التراب إلا عجب الذنب منه خلق و منه يركب.

( صحيح ) ( م د هـ ) عن أبي هريرة.

---

**[1] ئەم فەرموودەیە : كەسێك لە سەنەدەكەیدا هەیە بەناوی ( عبد الصمد بن نعمان )زۆر لە زانایان بە لاوازیان زانیوە و فەرموودەیان قبوڵ نەكردووە بڕوانە ( فيض القدير ٢٥/٤. ( وەرطێر )**

**٧٩٤٢- گڵ هەموو جەستەی ئادەمیزاد دەخوات ،تەنها** (عجب الذنب)**نەبێت ،لەو دروستکراوەو ،لەوەش جارێکی تر پێکدەهێنرێتەوە .**

( الطحاوية ٤٠١ )

٧٩٤٣- كيف أنتم و صاحب القرن قد التقم القرن و حنا الجبهة و أصغى السمع ينتظر متى يؤمر بالنفخ فينفخ قالوا: كيف نصنع ؟ قال قولوا: حسبنا الله و نعم الوكيل على الله توكلنا.

( صحيح ) ( حم ت حب ك ) عن أبي سعيد ( حم ك ) عن ابن عباس ( حم طب ) عن زيد بن أرقم ( أبو الشيخ في العظمة ) عن أبي هريرة ( حل ) عن جابر ( الضياء ) عن أنس.

**٧٩٤٣- دەبێ حاڵتان چۆن بێت ئەو کاتەی خاوەن کەڕەناکە ،کەڕەناکەی لە دەمدایە سەری دانەواندووە و ،گوێی هەڵخستووە چاوەڕوانە کەی فەرمانی پێبکرێت فووی پیابکات ،وتیان : چی بکەین ؟ فەرمووی : بڵێن : خوامان بەسەو ،ئەو چاکترین خۆ پێ سە پێردراوە ، پشتمان بە خوای خۆمان بەست .**

( الصحيحة ١٠٧٨ )

٧٩٤٤- ما بين النفختين أربعون ثم ينزل الله من السماء ماء فينبتون كما ينبت البقل و ليس من الإنسان شيء إلا يبلى إلا عظم واحد و هو:عجب الذنب منه خلق و منه يركب يوم القيامة.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة.

**٧٩٤٤- لە نێوان هەردوو فوو پیاکردنەکەدا چلساڵ هەیە ،ئینجا خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت سەرهەڵدەدەنەوە هەروەکو ڕوەك چەکەرە دەکاتەوە ،هەموو شتێکیش لە مرۆڤدا لە نێو دەچێت جگە لە ئیسقانێك ئەویش کلێنچکە ( عجب الذنب ) ە ،لەوە دروستکراوەو ،لەوەیش پێکدەهێنرێتەوە .**

( المشكاة ٥٥٢١ )

٧٩٤٥- من نوقش الحساب عذب.

( صحيح ) ( ق ) عن عائشة.

**٧٩٤٥- هەرکەس لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت سزا دەدرێت .**

( الترغيب ٣٥٩٤ )

٧٩٤٦- من نوقش المحاسبة هلك.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن الزبير.

**٧٩٤٦- هەركەس لە لێپرسینەوەدا لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا بكرێت تیا دەچێت .**

( المشكاة ٥٥٢٦ )

٧٩٤٧- الميت يبعث في ثيابه التي يموت فيها.

( صحيح ) ( د حب ك ) عن أبي سعيد.

**٧٩٤٧- مردوو لەو پۆشاكەیدا زیندوو دەكرێتەوە كە تیایدا مردووە .**

( الصحيحة ١٦٧١ )

٧٩٤٨- لا يستر الله على عبد في الدنيا إلا ستره يوم القيامة.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٩٤٨- خوای گەورە هەر بەندەیەك لە دونیادا داپۆشێت ،لە قیامەتیشدا هەر دایدەپۆشێت .**

( الترغيب ١٣٧٤ )

٧٩٤٩- يبعث الناس على نياتهم.

( صحيح ) ( حم ) عن أبي هريرة.

**٧٩٤٩- خەڵكی لەسەر نییەتەكانیان زیندوو دەكرێنەوە .**

( الترغيب ١٣ )

٧٩٥٠- يبعث كل عبد على ما مات عليه.

( صحيح ) ( م هـ ) عن جابر.

**٧٩٥٠- هەموو بەندەیەك لەسەر ئەوە زیندوو دەكرێتەوە كە لەسەری دەمرێت .**

( السنة ٧٦٥ )

٧٩٥١- يقوم أحدهم في رشحه إلى أنصاف أذنيه.

( صحيح ) ( خ ت هـ ) عن ابن عمر.

**٧٩٥١- كەسی واهەیە دەكەوێتە نێو ئارەقی خۆیەوە تاكو نیوەی گوێی .**

( الترغيب ٣٥٨٦ )

٧٩٥٢- كيف بكم إذا جمعكم الله كما يجمع النبل في الكنانة خمسين ألف سنة لا ينظر إليكم ؟.

( صحيح ) ( طب ك ) عن ابن عمرو.

**٧٩٥٢- دەبێ حاڵتان چۆن بێت كاتێك خواى گەورە كۆتان دەكاتەوە وەكو كۆكردنەوەى تیر لە تیرداندا ، پەنجا هەزار ساڵ و تەماشاتان نەكات .**

( الصحيحة ٢٨١٧ )

## بابەتى حەوزى پێغەمبەر ﷺ

٧٩٥٣- أمامكم حوض كما بين جرباء و أذرح.

( صحيح ) ( خد ) عن ابن عمر .

**٧٩٥٣- لە پێشتانەوە حەوزێك هەیە ئەوندەى نێوان** ( جرباء )**و** ( أذرح )**ە**[1].

( المشكاة ٥٦٠٧ )

٧٩٥٤- أنا فرطكم على الحوض.

( صحيح ) ( حم ق ) عن جندب ( خ ) عن ابن مسعود ( م ) عن جابر بن سمرة .

**٧٩٥٤- من پێشەنگى ئێوەم لەسەر حەوزەكە .**

( السنة ٧٣٥ )

٧٩٥٥- أنا فرطكم على الحوض أنتظركم ليرفع لي رجال منكم حتى إذا عرفتهم اختلجوا دوني فأقول: رب أصحابي ! رب أصحابي ! فيقال: إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك.

( صحيح ) ( حم خ ) عن حذيفة .

**٧٩٥٥- من پێشەنگى ئێوەم لەسەر حەوزەكە چاوەڕوانتان دەكەم بۆ ئەوەى پیاوانێك لە ئێوە بەرزكرێنەوە بۆلام ،كاتێك دەیان ناسم دوور دەخرێنەوە لێم دەڵێم : پەروەردگارم هاوەڵەكانم! پەروەردگارم هاوەڵەكانم! جا دەوترێت : تۆ نازانیت دواى تۆ چییان كرد.**

( السنة ٧٦١ )

٧٩٥٦- أنا فرطكم على الحوض و لأنازعن أقواما ثم لأغلبن عليهم فأقول: يا رب أصحابي أصحابي ! فيقول: إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك.

( صحيح ) ( حم ق ) عن ابن مسعود .

---

[1] **ناوى دوو گوندە لە شام .**

**٧٩٥٦- من لە پێش ئێوە دەچمە سەر حەوزەكە ،لەگەڵ كەسانێكیشدا مشت و مڕ دەكەم و زاڵیش دەبم بە سەریاندا و ،دەڵێم : خوایە هاوەڵانم ! خوایە هاوەڵانم !،دەڵێت : تۆ نازانی دوای تۆ چیان داهێناوە .**

( السنة ٧٦٢ )

٧٩٥٧- إن الأنبياء يتباهون أيهم أكثر أصحابا من أمته فأرجو أن أكون يومئذ أكثرهم كلهم واردة و إن كل رجل منهم يومئذ قائم على حوض ملآن معه عصا يدعو من عرف من أمته و لكل أمة سيما يعرفهم بها نبيهم.

( صحيح ) ( طب ) عن سمرة .

**٧٩٥٧- بەڕاستی پێغەمبەرەكان شانازی دەكەن كامیان هاوەڵیان زۆرترە لە ئوممەتەكەی، هیوام وایە لە هەموویان هاوەڵم زۆرتربێت ،هەموو پێغەمبەرێكیش لەو پێغەمبەرانە لەسەر حەوزێكی پڕە ،دارێكی پێیە بانگی ئەوانە دەكات كە دەیان ناسێت لە ئوممەتەكەی،هەموو ئوممەتێكیش نیشانەیەكی هەیە پێغەمبەرەكەیان بەوە دەیانناسێتەوە .**

( الصحيحة ١٥٨٩ )

٧٩٥٨- إن أمامكم حوضا كما بين جرباء و أذرح فيه أباريق كنجوم السماء من ورده فشرب منه لم يظمأ بعدها أبدا.

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمر .

**٧٩٥٨- بەڕاستی لە پێشتانەوە حەوزێك هەیە ئەوندەی نێوان** ( جرباء )**و** ( أذرح )**ە ، ئەوەندە قاپی تیایە وەكو ئەستێرەكانی ئاسمان ،هەركەس بچێتە سەری و لێی بخواتەوە هەرگیز جارێكی تر تینووی نابێت .**

( السنة ٧٢٧ )

٧٩٥٩- إن أمامكم حوضا ما بين ناحيتيه كما بين جرباء و أذرح.

( صحيح ) ( حم م ) عن ابن عمر .

**٧٩٥٩- بەڕاستی لە پێشتانەوە حەوزێك هەیە نێوان هەردوو لاشیپانەكەی وەكو** (جرباء) **و** (أذرح )**ە.**

( صحيح ابی داود ٤٧٤٥ )

٧٩٦٠- إن حوضي أبعد من أيلة من عدن لهو أشد بياضا من الثلج و أحلى من العسل باللبن و لآنيته أكثر من عدد النجوم و إني لأصد الناس عنه كما يصد الرجل إبل الناس عن حوضه

قالوا: أتعرفنا يومئذ ؟ قال: نعم لكم سيما ليست لأحد من الأمم تردون علي غرا محجلين من أثر الوضوء.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة .

**٧٩٦٠- حەوزى من دوورترە لە دوورى ئەيلە لە عەدەن ،سپى ترە لە بەفرو شيرينترە لە هەنگوين بە شيرەوە ،قاپەكانيشى زۆرترن لە ئەستێرەكانى ئاسمان ،منيش خەڵكى لێ دووردەخەمەوە وەكو چۆن پياوێك وشترى خەڵكى لە حەوزى خۆى دوور دەخاتەوە : وتيان: ئايا لەو ڕۆژەدا دەمان ناسى ؟ فەرمووى : بەڵێ ،سيمايەكتان هەيە هيچ ئوممەتێكى تر نييەتى ،دێنە سە ر حەوزەكەم پەل و نێو چاوانتان سپى و درەوشاوەيە بە هۆى شوێنەوارى دەست نوێژەوە .**

( المشكاة ٥٥٦٨ )

٧٩٦١- إن حوضي لأبعد من أيلة إلى عدن و الذي نفسي بيده لآنيته أكثر من عدد نجوم السماء و لهو أشد بياضا من اللبن و أحلى من العسل و الذي نفسي بيده إني لأذود عنه كما يذود الرجل الإبل الغريبة عن حوضه قالوا: يا رسول الله أوتعرفنا ؟ قال: نعم تردون علي الحوض غرا محجلين من آثار الوضوء ليست لأحد غيركم.

( صحيح ) ( م هـ ) عن حذيفة .

**٧٩٦١- حەوزى من دوورترە لە دوورى ئەيلە لە عەدەن ،سوێندن بەوەى گيانى منى بەدەستە قاپەكانى زۆرترن لە ئەستێرەكانى ئاسمان و ،سپى ترە لە شيرو ،شيرينترە لە هەنگوين ،سوێند بەوەى گيانى منى بەدەستە ڕێگرى كەسانێكى لێ دەكەم وەكو چۆن پياوێك وشترى نامۆ لە حەوزى خۆى دور دەخاتەوە ،وتيان : ئەى پێغەمبەرى خوا ئايا دەماننناسيتەوە ؟ فەرمووى : بەڵێ ،دێنە سەر حەوزەكم پەل و نێو چاوانتان سپى و درەوشاوەيە بەهۆى شوێنەوارى دەست نوێژەوە ،كەسى تر ئەو نيشانەيەى نييە .**

( الصحيحة ٣٥٢٩ )

٧٩٦٢- إن حوضي من عدن إلى عمان البلقاء ماؤه أشد بياضا من اللبن و أحلى من العسل أكاويبه عدد النجوم من شرب منه شربة لم يظمأ بعدها أبدا أول الناس ورودا عليه فقراء المهاجرين: الشعث رؤوسا الدنس ثيابا الذين لا ينكحون المنعمات و لا تفتح لهم السدد الذين يعطون الحق الذي عليهم و لا يعطون الذي لهم.

( صحيح ) ( حم ت هـ ك ) عن ثوبان .

**٧٩٦٢- حەوزی من لە عەدەنەوە بۆ عومانی بەلقایە ،ئاوەکەی سپی ترە لە شیر و ، شیرنیترە لە هەنگوین ، پەرداخەکانی بە گوێرەی ژمارەی ئەستێرەکانە ،هەرکەس جارێك لێی بخواتەوە ئیتر تینووی نابێتەوە ،یەکەمین کەسانێك دێنە سەر حەوزەکەم هەژارانی کۆچکارەکانە ،قژ گژو جل سپی یەکان ،ئەوانەی ئافرەتانی خۆشگوزەرانیان لێ مارە ناکرێت و ،دەرگای داخراویان بۆ ناکرێتەوە ،ئەوانەی ئەو مافەی لەسەریانە دەی دەن و ،ئەویشی مافی خۆیانە نایان درێتێ .**

( المشكاة ٥٥٩٢ )

٧٩٦٣- إن في حوضي من الأباريق بعدد نجوم السماء.

( صحيح ) ( ت ) عن أنس .

**٧٩٦٣- بەڕاستی لەسەر حەوزەکەم بە گوێرەی ئەستێرەکان قاپ هەیە .**

( الطحاوية ١٨٨ )

٧٩٦٤- إن قدر حوضي كما بين أيلة و صنعاء من اليمن و إن فيه من الأباريق كعدد نجوم السماء.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أنس .

**٧٩٦٤- حەوزەکەم ئەوەندەی نێوان ئەیلەو سەنعایە لە یەمەن قاپەکانیشی وەکو ئەستێرەکانی ئاسمانن .**

( الطحاوية ١٨٨ )

٧٩٦٥-إن لكل نبي حوضا و إنهم يتباهون أيهم أكثر واردة و إني أرجوا أن أكون أكثرهم واردة.

( صحيح ) ( ت ) عن سمرة .

**٧٩٦٥- هەموو پیغەمبەرێك حەوزێکی هەیە ،شانازیش دەکەن بەوەی کامیان خەڵکی زۆرتر دەچنە سەر حەوزەکەیان ،ئومێدەوارم لە هەموویان زیاتر خەڵکی بێتە سەر حەوزەکەم .**

( الصحيحة ١٥٨٩ )

٧٩٦٦- إني بين أيديكم فرط لكم و أنا شهيد عليكم و إن موعدكم الحوض و إني و الله لأنظر إلى حوضي الآن و إني قد أعطيت مفاتيح خزائن الأرض و إني و الله ما أخاف عليكم أن تشركوا بعدي و لكني أخاف عليكم الدنيا أن تنافسوا فيها.

( صحيح ) ( حم ق ) عن عقبة بن عامر .

**٧٩٦٦- من لە پێش ئێوەوە دەڕۆم و ،دەبمە شايەت بەسەرتانەوە ،وادەی ديارى كراوی ئێوەيش لاى حەوزەكەيە ،سوێند بە خوا من ئێستا دەڕوانمە حەوزەكەم،و بێگومان من كليلی گەنجينەكانى سەر زەويشم پێدراوە ،من ترسيشم نيە لە دوای خۆم بت پەرستى بكەن ،بەڵام ترسى ئەوەم هەيە لەسەر دونيا كێ بەركێ بكەن .**

( فقه السيرة ٢٩٢ )

٧٩٦٧- إني تارك فيكم خليفتين: كتاب الله حبل ممدود ما بين السماء و الأرض و عترتي أهل بيتي و إنهما لن يتفرقا حتى يردا علي الحوض.

( صحيح ) ( حم طب ) عن زيد بن ثابت .

**٧٩٦٧- من دوو جێنيشينم تياتاندا بە جێ هێشتووە : قورئان كە پەتێكى شۆڕ كراوەيە لەنێوان ئاسمان و زەويدا و ،خاو خێزانەكەم ،ئەو دووانە لە يەكتر جيا نابنەوە تاكو دێنە لام لەسەر حەوزەكە .**

( الروض النضير ٩٧٧ )

٧٩٦٨- إني تارك فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا بعدي أحدهما أعظم من الآخر كتاب الله حبل ممدود من السماء إلى الأرض و عترتي أهل بيتي و لن يتفرقا حتى يردا علي الحوض فانظروا كيف تخلفوني فيهما.

( صحيح ) ( ت ) عن زيد بن أرقم .

**٧٩٦٨- بەڕاستى من لەناو ئێوەدا شتێكم بە جێهێشتووە كە ئەگەر دەستيان پێوە بگرن هەرگيز گومڕا نابن يەكێكيان لەوی تريان مەزنترە : كيتابى خوا كە پەتێكى شۆڕكراوەيە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی ،هەروەها خاو خێزانەكەم ،ئەو دووانە لەيەكتر جيانابنەوە تاكو دێنە لام لەسەر حەوزەكە ، جا بڕوانن چۆن جێنشينى من دەكەن لەو دووانەدا .**

( الروض النضير ٩٧٧ )

٧٩٦٩- إني على الحوض حتى أنظر من يرد علي منكم و سيؤخذ أناس دوني فأقول: يا رب مني و من أمتي ! فيقال: هل شعرت ما عملوا بعدك ؟ و الله ما برحوا بعدك يرجعون على أعقابهم.

( صحيح ) ( ق ) عن أسماء بنت أبي بكر ( حم م ) عن عائشة .

**٧٩٦٩- من لەسەر حەوزەكەم تاكو بزانم كامتان دێت بۆ لام ،كەسانێكيش دوور دەخرێنەوە لە من و دەڵێم : پەروەردگارم لە من و ئوممەتەكەم ! جا دەوترێت : ئايا**

**زانيت لە پاش تۆ چييان كردوە ؟ بەو خوايە لە دواى تۆ زۆريان پێ نەچوو كە هەڵگەڕانەوە .**

( الترغيب ٣٦٢٤ )

٧٩٧٠- إني فرطكم على الحوض من مر بي شرب و من شرب لم يظمأ أبدا و ليردن علي أقوام أعرفهم و يعرفوني ثم يحال بيني و بينهم فأقول: إنهم مني فيقال: إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك فأقول: سحقا سحقا لمن بدل بعدي

( صحيح ) ( حم ق ) عن سهل بن سعد وأبي سعيد .

**٧٩٧٠- من پێشەنگى ئێوەم لەسەر حەوزەكە ،هەركەس بەلامدا تێپەڕبێت لێى دەخواتەوە ،هەركەسيش لێ ى بخواتەوە هەرگيز تينووى نابێتەوە ،كەسانێكيش دێنەلام دەيان ناسم و دەمنناسن ،بەڵام نێوانمان دادەبڕێت و ئينجا دەڵێم : ئەوانە لە منن ، ئينجا دەوترێت : تۆ نازانى دواى تۆ چييان داهێنا ،ئينجا منيش دەڵێم : ئەولاترچن ئەولاترچن كەسانێك لە پاش من گۆڕانكاريان لە ديندا كردووە .**

( المشكاة ٥٥٧١ )

٧٩٧١- إني فرطكم على الحوض و إن عرضه كما بين أيلة إلى الجحفة أني لست أخشى عليكم أن تشركوا بعدي و لكن أخشى عليكم الدنيا أن تنافسوا فيها و تقتتلوا فتهلكوا كما هلك من كان قبلكم.

( صحيح ) ( م ) عن عقبة بن عامر .

**٧٩٧١- من پێشەنگى ئێوەم لەسەر حەوزەكە ،بەڕاستى پانيەكەى وەكو ماوەى نێوان ئەيلەيە تاكو جوحفەيە ،من ترسى ئەوەم نييە ،لەپاش خۆم بت پەرستى بكەن ،بەڵام ترسى ئەوەم هەيە كە لەسەر دونيا كێبەڕكێ بكەن و ،يەكتر بكوژن و ، بەو هۆيەوە لە نێو بچن وەكو چۆن ئەوانەى پێش ئێوە لە نێو چوون .**

( الجنائز )

٧٩٧٢- إني لبعقر حوضي يوم القيامة أذود الناس لأهل اليمن و أضربهم بعصاي حتى يرفض عليهم فسئل عن عرضه ؟ فقال: من مقامي إلى عمان شرابه أشد بياضا من اللبن و أحلى من العسل يصب فيه ميزابان يمدانه من الجنة أحدهما من ذهب و الآخر من ورق.

( صحيح ) ( حم م ) عن ثوبان .

**٧٩٧٢- من لەلای حەوزەکەمدا لە ڕۆژی قیامەتدا پاڵ بە خەڵکەوە دەنێم بۆ خەڵکی یەمەن و بە دارەکەم لێیان دەدەم تاکو بڕژێتە سەریان ،جا پرسیاری پانایییەکەی لێ کرا، فەرمووی : لەم جێگایەمەوە بۆ عومان پانە ،ئاوەکەشی سپی ترە لە شیر ،شیرنترە لە هەنگوین ،دوو ئابارەی بە دەمەوەیە کە لە بەهشتەوەن ،یەکێکیان لە ئاڵتوونە و ، یەکێکیان لە زیوە .**

( الترغيب ٣٦١٥ )

٧٩٧٣- إني لست مثلكم إني أبيت يطعمني ربي و يسقيني.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أنس ( خ ) عن ابن عمر وأبي سعيد وأبي هريرة وعن عائشة .

**٧٩٧٣-من وەکو ئێوە نیم،من شەو ڕۆژ دەکەمەوە، پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێ دەدات.**

٧٩٧٤- إني لكم فرط على الحوض فإياي لا يأتين أحدكم فيذب عني كما يذب البعير الضال فأقول: فيم هذا ؟ فيقال: إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك فأقول: سحقا.

( صحيح ) ( م ) عن أم سلمة .

**٧٩٧٤- من پێشینەی ئێوەم لەسەر حەوزەکە ،با کەسێکتان نەیەتە لام و دووربخرێتەوە لێم ،وەکو چۆن وشتری وویڵ و ونبوو دوور دەخرێتەوە ،منیش دەڵێم :ئەوە لەبەر چی ؟ دەوترێ : تۆ نازانیت دوای تۆ چیان کردووە ،منیش دەڵێم : ئەولاترچن .**

( الصحيحة ٣٤٩٩ )

٧٩٧٥- ألا إني فرط لكم على الحوض و إن بعد ما بين طرفيه مثل ما بين صنعاء و أيلة كأن الأباريق فيه النجوم.

( صحيح ) ( حم م ) عن جابر بن سمرة .

**٧٩٧٥-بەڵێ من پێشەنگی ئێوەم لەسەر حەوزەکە بەڕاستی ،دووری نێوان هەردوو لاشیپانیەکەی وەکو ماوەی نێوان صەنعاو ئەیلەیە ،قاپەکانی دەڵێی ئەستێرەکانی ئاسمانن.**

( السنة ٧٥١ )

٧٩٧٦- ترد علي أمتي الحوض و أنا أذود الناس عنه كما يذود الرجل إبل الرجل عن إبله قالوا: يا نبي الله تعرفنا ؟ قال: نعم لكم سيما ليست لأحد غيركم تردون علي غرا محجلين من آثار الوضوء و ليصدن عني طائفة منكم فلا يصلون فأقول: يا رب هؤلاء من أصحابي ! فيجيبني ملك فيقول: و هل تدري ما أحدثوا بعدك

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة .

**٧٩٧٦- ئوممەتەكەم دێنە سەر حەوزەكەم بۆ لام و ،منیش خەڵكی لەسەر ڕاودەنێم وەكو چۆن پیاوێك وشتر لەسەر حەوزەكەی ڕاودەنێت ،وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دەمانناسیتەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ ،سیمایەكتان هەیە كەكسی تر نییەتی ،دێن بۆ لام لەلای حەوزەكە نێوچاوان و پەلەكانتان سپی یەو دەدرەوشێتەوە بەهۆی شوێنەواری دەست نوێژەوە كەسانێكیشتان لە من دوور دەخرێنەوە و بە من ناگەن ،دەڵێم خوایە ئەوانە هاوەڵی منن !جا فریشتەیەك وەڵامم دەداتەوە و ،دەڵێت : ئایا تۆ دەزانیت لە پاش تۆ چییان داهێناوە .**

( الصحيحة ٣٩٢٢ )

٧٩٧٧- تركت فيكم شيئين لن تضلوا بعدهما: كتاب الله و سنتي و لن يتفرقا حتى يردا علي الحوض.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة .

**٧٩٧٧- دوو شتم لە نێوتاندا بەجێهێشتووە : لە دوای دەست گرتن پێیانەوە گومڕانابن، قورئان و سونەتەكانم هەرگیز ،لەیەكتریش جیانابنەوە تاكو دێن بۆ لام لەسەر حەوزەكەم .**

( الصحيحة ١٧٦١ )

٧٩٧٨- حوضي كما بين صنعاء و المدينة فيه الآنية مثل الكواكب

( صحيح ) ( ق ) عن حارثة بن وهب وعن المستورد .

**٧٩٧٨- حەوزی من وەكو ماوەی نێوان صەنعاو مەدینەیە ،قاپەكانیشی وەكو ژمارەی هەسارەكانن .**

( ظلال الجنة ٧١٨ )

٧٩٧٩- حوضي مسيرة شهر و زواياه سواء و ماؤه أبيض من اللبن و ريحه أطيب من المسك و كيزانه كنجوم السماء من يشرب منه فلا يظمأ أبدا.

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمرو .

**٧٩٧٩- حەوزەكەم مانگە ڕێیەكە ،گۆشەكانیشی یەككسانن و ،ئاوەكەی لە شیر سپی ترە و ، لە گوڵاو بۆنی خۆشترە و ،بادەكانی بە گوێرەی ئەستێرەی ئاسمانن ،هەركەسیش لێی خواردەوە هەرگیز تینووی نابێتەوە .**

( الصحيحة ١٧٦١ )

٧٩٨٠- خلفت فيكم شيئين لن تضلوا بعدهما: كتاب الله و سنتي و لن يتفرقا حتى يردا علي الحوض.

( صحيح ) ( أبو بكر الشافعي في الغيلانيات ) عن أبي هريرة .

**٧٩٨٠- دوو شتم تیاتاندا بەجیٰ هێشتووە لە دوای پابەندبوون پێیانەوە هەرگیز گومڕانابن ،: قورئان و سوونەتەکانم من ،لە یەکتریش جیانابنەوە تاکو نەیەن بۆ لام لەسەر حەوزەکە .**

( الصحيحة ١٧٦١ )

٧٩٨١- صنفان من أمتي لا يردان على الحوض و لا يدخلان الجنة: القدرية و المرجئة.

( صحيح ) ( طس ) عن أنس.

**٧٩٨١- دوو جۆر لە ئوممەتەکەم نایەنە سەر حەوزەکەم و ،ناچنە بەهەشتیشەوە : قەدەری و مورجیئەکان .**

( الصحيحة ٢٧٤٨ )

٧٩٨٢- عدد آنية الحوض كعدد نجوم السماء .

( صحيح ) ( أبو بكر بن أبي داود في البعث ) عن أنس.

**٧٩٨٢- ژمارەی قاپەکانی حەوزەکە ،وەکو ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە .**

( المشكاة ٥٥٦٩ )

٧٩٨٣- الكوثر نهر أعطانيه الله في الجنة ترابه مسك أبيض من اللبن و أحلى من العسل ترده طائر أعناقها مثل أعناق الجزر آكلها أنعم منها.

( صحيح ) ( ك ) عن أنس.

**٧٩٨٣- کەوسەر ڕوبارێکە لە بەهەشتدا خوای گەورە بە منی بەخشیوە ،خۆڵەکەی گوڵاوە، سپی ترە لە شیر ،شیرینترە لە هەنگوین ،باڵندەیەك دێتە لای ملی وەکو ملی وشترە ،خواردنی لە خۆی خۆشترو ناسکترە .**

( المشكاة ٥٦٤١ )

٧٩٨٤- الكوثر نهر في الجنة حافتاه من ذهب و مجراه على الدر و الياقوت تربته أطيب ريحا من المسك و ماؤه أحلى من العسل و أشد بياضا من الثلج.

( صحيح ) ( حم ت هـ ) عن ابن عمر.

**٧٩٨٤- ( كوثر ) ڕووبارێکە لە بەهەشتدا ،لێوارەکانی لە ئاڵتوونە و سولاّوەکەی لە مرواری و یاقووتە ،لمەکەی لە گولاّو بۆنی خۆشترە ،ئاوەکەشی لە هەنگوین شیرینترە و ، لە شیر سپیترە.**

( المشكاة ٥٦٤١ )

٧٩٨٥- لأذودن عن حوضي رجالا كما تذاد الغريبة من الإبل.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٧٩٨٥- كەسانێك لەمسەر حەوزەكەم وەدەردەنێم وەكو چۆن وشترى نامۆ پاڵ دەنرێت .**

( الصحيحة ٣٩٥٢ )

٧٩٨٦- لتزدحمن هذه الأمة على الحوض ازدحام إبل وردت لخمس.

( صحيح ) ( طب ) عن العرباض.

**٧٩٨٦- ئەم ئوممەتە لەسەر حەوزەكەم قەرەباڵغى دەكەن وەكو كۆمەڵە وشترێك چوار رۆژ لە ئاو نەدرابێت و ،رۆژى پێنجەم ئاو بدرێت .**

( الصحيحة ٢١٤٥ )

٧٩٨٧- ليردن علي ناس من أصحابي الحوض حتى إذا رأيتهم و عرفتهم اختلجوا دوني فأقول: يا رب ! أصحابي أصحابي فيقال لي: إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أنس وحذيفة.

**٧٩٨٧- كەسانێك لە هاوەڵانم دێن بۆ لام لەسەر حەوزەكە ،كە دەيان بينم دەيان ناسم بەلام دووردەخرێنەوە لێم ،منيش دەڵێم : ئەى پەروەردگارم ! هاوەڵەكانم هاوەڵەكانم! جا پێم دەوترێت : تۆ نازانى ئەوانە لەدواى تۆ چييان داهێناوە .**

( الطحاوية ١٨٨ )

٧٩٨٨- ما أنتم بجزء من مائة ألف جزء ممن يرد علي الحوض.

( صحيح ) ( حم د ك ) عن زيد بن أرقم.

**٧٩٨٨- ئێوە بەشێكن لە سەد هەزار بەش لە وانەى دێنەسەر حەوزەكەم .**

( الصحيحة ١٢٣ )

٧٩٨٩- ما بين ناحيتي حوضي كما بين صنعاء و المدينة أو كما بين المدينة و عمان ترى فيه أباريق الذهب و الفضة كعدد نجوم السماء أو أكثر.

( صحيح ) ( حم م هـ ) عن أنس.

**٧٩٨٩- لە نێوان هەردوولاى حەوزەكەمدا وەكو ماوەى نێوان صەنعاو مەدينەيە و،يا مەدينە و عەممانە ،قاپى ئاڵتوون و زيوى لەسەر دەبينى ،وەكو ژمارە ئەستێرەكانى ئاسمان و زۆر تريش .**

( السنة ٧١٤ )

٧٩٩٠- و الذي نفسي بيده لآنيته - يعني الحوض - أكثر من عدد نجوم السماء و كواكبها في الليلة المظلمة المصحية آنية الجنة من شرب منها ليس يظمأ آخر ما عليه يشخب فيه ميزابان من الجنة من شرب منه لم يظمأ عرضه مثل طوله ما بين عمان إلى أيلة ماؤه أشد بياضا من اللبن و أحلى من العسل.

( صحيح ) ( حم م ت ) عن أبي ذر.

**٧٩٩٠- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ،قاپەكانی – واتە : حەوزەكە- زیاترە لە ژمارەی ئەستێرەكان هەسارەكانی ئاسمان لە تاریكی شەوی[1] سایەقەدا ،قاپەكانی بەهەشت ئەو كەسەی ئاویان تیا بخواتەوە ئیتر هەرگیز تینووی نابێتەوە ، نموونەی درێژی وەكو ماوەی نێوان عەممان و ئەیلەیە ،ئاوەكەی سپی ترە لە شیر وشیرینترە لە هەنگوین .**

( الصحيحة ٣٥٢٦ )

٧٩٩١- و الذي نفسي بيده لأذودن رجالا عن حوضي كما تذاد الغريبة من الإبل عن الحوض.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة.

**٧٩٩١- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ،كەسانێك دووردەخەمەوە لە حەوزەكەم ،هەر وەكو دەركردنی وشتری نامۆ لەسەر حەوز .**

( السنة ٧٦٩ )

٧٩٩٢- يرد علي يوم القيامة رهط من أصحابي فيجلون عن الحوض فأقول: أي رب ! أصحابي فيقول: إنك لا علم لك بما أحدثوا بعدك إنهم ارتدوا بعدك على أدبارهم القهقرى.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة.

**٧٩٩٢- كۆمەڵێك لە هاوەڵانم دێنەلام لە ڕۆژی قیامەتدا و ،دەردەكرێن لەسەر حەوزەكەم و ،منیش دەڵێم : پەروەردگارم ! هاوەڵەكانم ،جا دەفەرموێت : تۆ نازانیت دوای تۆ چییان داهێناوە ،ئەوانە پاشەو پاش هەڵگەڕانەوە لەدوای تۆ.**

( الصحيحة ٣٩٥٢ )

٧٩٩٣- هل تدرون ما الكوثر ؟ هو نهر أعطانيه ربي في الجنة عليه خير كثير ترد عليه أمتي يوم القيامة آنيته عدد الكواكب يختلج العبد منهم فأقول: يا رب أنه من أمتي فيقال: إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك.

( صحيح ) ( حم م د ن ) عن أنس.

---

[1] **سایەقە : ساماڵ واتە ساق و بێ هەور و هەلا .**

**٧٩٩٣- ئایا دەزانن ( کوثر ) چی یە ؟ ڕووبارێکە لەبەهەشتدا پەروەردگارم پێی بەخشیوم ، فەرو چاکەی زۆری لەسەرە ،ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا دێت بۆ لام لەوێ، قاپەکانی بەگوێرەی ژمارەی هەسارەکانە ،کەسی وایان هەیە دووردەخرێتەوە منیش دەڵێم : پەروەردگارم ئەوانە لە ئوممەتی منن ،بەڵام دەوترێت : تۆ نازانیت لەدوای تۆ چییان کردوە .**

( السنة ٧٦٤ )

## بابەتی تکا کردن ( شەفاعەت )

٧٩٩٤- أتاني آت من عند ربي فخيرني بين أن يدخل نصف أمتي الجنة و بين الشفاعة فاخترت الشفاعة و هي لمن مات لا يشرك بالله شيئا.

( صحيح ) ( حم ) عن أبي موسى ( ت حب ) عن عوف بن مالك الأشجعي .

**٧٩٩٤- کەسێك لەلای پەروەردگارمەوە هات بۆ لام و ،سەرپشکی کردم لە نێوان ئەوەی نیوەی ئوممەتەکەم بچنە بەهەشتەوە و ،لە (شەفاعەت) تکاکردندا ،منیش شەفاعەتم هەڵبژارد ،ئەوەش بۆ کەسێکە مردبێت و هیچ هاوبەشێکی بۆ خوا بڕیار نەدابێت .**

( المشكاة ٥٦٠٠ )

٧٩٩٥- إذا كان يوم القيامة كنت إمام النبيين و خطيبهم و صاحب شفاعتهم غير فخر.

( صحيح ) ( حم ت هـ ك ) عن أبي بن كعب .

**٧٩٩٥- لە ڕۆژی قیامەتدا من پێشەوای پێغەمبەران و وتاربێژیانم ،خاوەنی شەفاعەتیانم و ،شانازیش ناکەم .**

( المشكاة ٥٧٦٨ )

٧٩٩٦- أما أهل النار الذين هم أهلها فإنهم لا يموتون فيها و لا يحيون و لكن ناس أصابتهم النار بذنوبهم فأماتتهم إماتة حتى إذا كانوا فحما أذن بالشفاعة فجيء بهم ضبائر ضبائر فبثوا على أنهار الجنة ثم قيل: يا أهل الجنة أفيضوا عليهم فينبتون نبات الحبة تكون في حميل السيل.

( صحيح ) ( حم م هـ ) عن أبي سعيد .

**٧٩٩٦- خەڵكى دۆزەخيش نيشتەجێى ئەوێن ،نامرن تيايداو ژيانيشيان نيە بەڵكو كەسانێكن بە بۆنەى تاوانەكانيانەوە ئاگر دەيان گرێتەوە و ،وەكو مردن دەيا نمرێنىّ[1] ، كاتێك دەبنە خەڵوز رێگەدەدرێت بۆ تكاكردن ، ئيتر دەهێنرێن وەكو كەل و پەل و بلاَوەيان پىّ دەكرێت لەسەر رووبارەكانى بەهەشت ،ئينجا دەوترێت : ئەى خەڵكى بەهەشت ئاويان بەسەردا برژێنن ،ئيتر سەوز دەبن لەچەشنى روەك گەشە دەكەن ،بە خێرايى سەوز دەبنەوە لە جوانترين شێوەداوەكو روەكى كەنارى دەريا .**

( الصحيحة ١٥٥١ )

٧٩٩٧- أنا سيد ولد آدم يوم القيامة و أول من ينشق عنه القبر و أول شافع و أول مشفع.

( صحيح ) ( م د ) عن أبي هريرة .

**٧٩٩٧- من سەردارى ئادەميزادەكانم لە رۆژى قيامەتدا ،يەكەمين كەسيشم گۆرى بۆ شەق دەكرێت و ،يەكەمين تكاكاريشم و ،يەكەمين كەسيشم كە تكام وەردەگيردرێت .**

( الطحاوية ١٠٧ )

٧٩٩٨- أنا سيد ولد آدم يوم القيامة و لا فخر و بيدي لواء الحمد و لا فخر و ما من نبي يومئذ آدم فمن سواه إلا تحت لوائي و أنا أول شافع و أول مشفع و لا فخر.

( صحيح ) ( حم ت هـ ) عن أبي سعيد .

**٧٩٩٨- من سەردارى نەوەى ئادەمم بە بىّ شانازى ،ئالاَى سوپاس گوزاريشم بە دەستەوەيە بە بىّ شانازى ،هەرچى پێغەمبەران و لەوان خوارتريش هەيە لە ژێر ئالاَى مندان و ،يەكەم تكاكار و تكا لێوەرگيراويشم بەبىّ شانازى .**

( الصحيحة ١٥٧١ )

٧٩٩٩- إن الناس يصيرون يوم القيامة جثا كل أمة تتبع نبيها يقولون: يا فلان اشفع يا فلان اشفع حتى تنتهي الشفاعة إلى محمد صلى الله عليه وسلم فذلك يوم يبعثه الله المقام المحمود.

( صحيح ) ( خ ) عن ابن عمر .

---

**[1] مەناوى دەڵێت : واتە پاش ئەوەى ئەشكەنجە دەچێژن ئەوەندەى خواى گەورە ويستى لەسەرە ، ئەوەيش مراندنێكى راستە قينەيە ،سوودى ئاگريش وێراى هەست پێكردنى بۆ تەمێكردنە بە دوورخستنەوەيان لە خۆشى بەهەشت لەو ماوەيە ،ئينجا زيندانى دەكرێن لە دۆزەخدا بە بىّ هەست كردن ئەوەندەى كە خواى گەورە دەيەوێت ...**

**٧٩٩٩- بەڕاستی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بەچۆکدا دێن ،هەموو ئوممەتێك شوێن پێغەمبەرەکەیان دەکەون ، دەڵێن : ئەی فلانی تکامان بۆ بکە ،ئەی فلان تکامان بۆ بکە، تاکو دەگاتە موحەممەد ﷺ جا ئەوە ئەو ڕۆژەیە خوای گەورە دەینێرێتە جێگایەکی ستایش کراو .**

٨٠٠٠- إن لكل نبي دعوة قد دعا بها في أمته فاستجيب له ، وإني اختبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة.

(صحيح) (حم ق) عن أنس.

**٨٠٠٠- هەموو پێغەمبەرێك داواکارییەکی هەیە بۆ ئوممەتەکەی و بۆی جێ بەجێ دەکرێت، بەلأم من ئەو داواکاریەی خۆم شاردووەتەوە و ،کردومەتە شەفاعەت بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( المشكاة ٢٢٢٣ )

٨٠٠١- خيرت بين الشفاعة و بين أن يدخل شطر أمتي الجنة فاخترت الشفاعة.

( حم ) عن ابن عمر ه عن أبي موسى .

**٨٠٠١- سەرپشك کرام لە نێوان شەفاعەت و چونە بەهەشتی نیوەی ئوممەتەکەم ،منیش شەفاعەتم هەڵبژارد.**

( الضعيفة ٣٥٨٥ )

٨٠٠٢- سألت الله الشفاعة لأمتي فقال: لك سبعون ألفا يدخلون الجنة بغير حساب و لا عذاب قلت: رب زدني فحثا لي بيديه مرتين و عن يمينه و عن شماله.

( هناد ) عن أبي هريرة.

**٨٠٠٢- داوای شەفاعەتم کرد لە خوای گەورە بۆ ئوممەتەکەم ،ئەویش فەرمووی : حەفتا هەزار کەس لەبەر تۆ بچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسینەوە و ئەشکە نجەدان ،وتم : ئەی پەروەدرگارم بۆم زیاد بکە ئیتر لە پێش خۆیەوە دوو لەوپێچی بەرانبەری بۆ زیاد کردم و، هەروەها لەلای ڕاست و چە پیشیەوە .**

( الصحيحة ١٨٧٩ )

٨٠٠٣- شفاعتي لأهل الكبائر من أمتي.

( حم د ن حب ك ) عن جابر ( طب ) عن ابن عباس ( خط ) عن ابن عمر وكعب بن عجرة.

**٨٠٠٣- تكاكردنی من بۆ ئە نجامدەرانی تاوانەگەورەكانە لە ئوممەتەكەم .**

( المشكاة ٥٥٩٨ )

٨٠٠٤- يخرج قوم من النار بشفاعة محمد صلى الله عليه وسلم فيدخلون الجنة و يسمون الجهنميين.

( حم خ د ) عن عمران بن حصين.

**٨٠٠٤- خەڵكانێك لە دۆزەخ دەردەچن بە شەفاعەتی موحەممەد ﷺ و ،دەچنە بەهەشتەوە و ،ناو دەنرێن دۆزەخییەكان .**

( السنة ٨٤١ )

٨٠٠٥- يخرج من النار قوم بالشفاعة كأنهم الثعارير.

( ق ) عن جابر.

**٨٠٠٥- كەسانێك بە شەفاعەت لە دۆزەخ دەردەچن دەڵێی وردە خەیارن .**

( السنة ٨٤١ )

٨٠٠٦- يخرج من النار قوم بعد ما احترقوا فيدخلون الجنة فيسميهم أهل الجنة الجهنميين.

( خ ) عن أنس.

**٨٠٠٦- كەسانێك لە ئاگر دەردەچن پاش ئەوەی دەسوتێن و ،دەچنە بەهەشتەوە جا خەڵكی بەهەشت ناویان دەنێن دۆزەخییەكان .**

( السنة ٨٤٥ )

٨٠٠٧- يخرج من النار من قال: لا إله إلا الله و كان في قلبه من الخير ما يزن شعيرة ثم يخرج من النار من قال لا إله إلا الله و كان في قلبه من الخير ما يزن برة ثم يخرج من النار من قال لا إله إلا الله و كان في قلبه من الخير ما يزن ذرة.

( حم ق ت ن ) عن أنس.

**٨٠٠٧- كەسی وا لە ئاگر دەردەچن وتویەتی** ( لاإله ألا الله ) **و تەنها ئەوەندەی دەنكە جۆیەك چاكە لە دڵیدا هەیە ،ئینجا كەسی وا لەئاگر دەردەچێت كە وتویەتی**( لاإله ألا الله) **و تەنها ئەوەندەی دەنكە گەنمێك چاكە لە دڵیدا هەیە، ئینجا كەسی وا لە دۆزەخ دەردەچێت كە وتویەتی** ( لاإله ألا الله )**و تەنها ،ئەوەندەی گەردیلەیەك چاكە لە دڵیاندا هەیە .**

( السنة ٨٤٩ )

٨٠٠٨- يخرج من النار من كان في قلبه مثقال ذرة من الإيمان.

( ت ) عن أبي سعيد.

**٨٠٠٨- كەسی وا لە دۆزەخ دەردەچێت تەنها بە ئەندازەی گەردیلەیەك باوەڕ لە دڵیدا هەیە .**

( الصحيحة ٢٤٥٠ )

٨٠٠٩- يخرج من النار أربعة فيعرضون على الله فيلتفت إليه أحدهم فيقول: أي رب ! إذا أخرجتني منها لا تعدني فيها فينجيه الله منها.

( م ) عن أنس.

**٨٠٠٩- چوار كەس لە دۆزەخ دەردەچن و ،ڕووبەڕووی پەروەردگار دەكرێنەوە ،یەكێكیان ئاوڕ دەداتەوەو ،دەڵێت : پەروەردگارم ! ئەگەر دەرتهێنام لێی جارێكی تر مەمگێڕەرەوە ناوی ،ئیتر خوای گەورە ڕزگاری دەكات .**

( السنة ٨٣٣ )

٨٠١٠- يخرج الله قوما من النار فيدخلهم الجنة.

( حم ق ) عن جابر.

**٨٠١٠- خوای گەورە كەسانێك لە دۆزەخ دەردەكات و ،دەیان خاتە بەهەشتەوە .**

( السنة ٨٤١ )

٨٠١١- يدخل الجنة بشفاعة رجل من أمتي أكثر من بنى تميم.

( ت ك ) عن عبدالله بن أبي الجدعاء.

**٨٠١١- بەتكاكردنی پیاوێك لە ئوممەتەكەم لە هۆزی تەمیم زیاتر دەچێتە بەهەشتەوە.**

( المشكاة ٥٦٠١ )

٨٠١٢- لكل نبي دعوة دعا بها في أمته فاستجيب له و إني أريد إن شاء الله أن أدخر دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة.

( ق ) عن أبي هريرة.

**٨٠١٢- هەموو پێغەمبەرێك پاڕانەوەیەكی هەیە بۆ ئوممەتەكەی خۆی و بۆی جێ بەجێ دەكرێت ،منیش بە ویستی خوای گەورە دەمەوێت ئەو پاڕانەوەیە پاشەكەوت بكەم بیكەمە تكا كردن بۆ ئوممەتەكەم لە ڕۆژی قیامەتدا .**

(ظلال الجنة ٧٩٧ )

٨٠١٣- لكل نبي دعوة قد دعا بها في أمته و إني خبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة.

( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٨٠١٣- هەموو پێغەمبەرێك نزایەكی هەیە بۆ ئوممەتەكەی منیش نزاكەی خۆم شاردووەتەوە بۆ ئوممەتەكەم كە لە ڕۆژی قیامەتدا تكایان بۆ بكەم.**

(ظلال الجنة ٧٩٧ )

٨٠١٤- لكل نبي دعوة مستجابة فتعجل كل نبي دعوته ، وإني خبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة فهي نائلة إن شاء الله من مات من أمتي لا يشرك بالله شيئا.

(صحيح) (م ت ه ) عن أبي هريرة.

**٨٠١٤- هەموو پێغەمبەرێك داواكارییەكی جێ بە جێ كراوی هەیە ،جا هەموو پێغەمبەرەكان پەلەیان كرد لەو داواكارییەیان ،منیش ئەوەم شاردووەتەوە وەكو تكاكردن بۆ ئوممەتەكەم لە ڕۆژی قیامەتدا ،جێبەجێیش دەبێت بە ویستی خوای گەورە بۆ كەسێك كە لەئوممەتەكەم بمرێت و ،هیچ هاوبەشێكی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێت.**

( المشكاة ١٢٢٣ )

٨٠١٥- لكل نبي دعوة يدعو بها فأريد أن أختبئ دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة.

( م ) عن أبي هريرة.

**٨٠١٥- هەموو پێغەمبەرێك پاڕانەوەیەكی گیركراوی هەیە ،منیش ئەو پاڕانەوەیەم هەڵگرتووە بۆ تكاكردن بۆ ئوممەتەكەم لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( المشكاة ٢٢٢٣ )

٨٠١٦- لكل نبي دعوة مستجابة يدعو بها فيستجاب له فيؤتاها و إني خبأت دعوتي شفاعة لأمتي يوم القيامة.

( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٨٠١٦- هەموو پێغەمبەرێك دوعایەكی گیرای هەیە بۆی جێ بەجێ دەكرێت ،منیش ئەو دوعایەم شاردووەتەوە بۆ ئوممەتەكەم بۆ ئەوەی تكایان بۆ بكەم لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( المشكاة ٢٢٢٣ )

٨٠١٧- ليدخلن الجنة بشفاعة رجل ليس بنبي مثل الحيين: ربيعة و مضر إنما أقول ما أقول.

( حم طب ) عن أبي أمامة.

**٨٠١٧- بە تكای ((شەفاعەتی)) پیاوێك لە ئوممەتەكەم كە پێغەمبەریش نیە ، ئەوەندەی هەردوو ئاوەدانی هۆزی ( ربيعة )و (مضر ) دەچنە بەهەشتەوە ،من ئەوە دەڵێم و دەیڵێمەوە .**

( الصحيحة ٢١٧٨ )

٨٠١٨- ليدخلن الجنة بشفاعة رجل من أمتي أكثر من بني تميم.

( حم ه حب ك ) عن عبدالله بن أبي الجدعاء.

**٨٠١٨- بە شافەعەتی پیاوێك لە ئوممەتەكەم زیاتر لە هۆزی بەنی تەمیم دەچنە بەهەشتەوە .**

( الصحيحة ٢١٧٨ )

٨٠١٩- المقام المحمود الشفاعة.

( حل هب ) عن أبي هريرة.

**٨٠١٩- جێگای ستایش كراو شەفاعەتە [1]**

( الصحيحة ٢٣١٩ )

٨٠٢٠- لعله تنفعه شفاعتي يوم القيامة فيجعل في ضحضاح من النار يبلغ كعبيه يغلي منه أم دماغه - يعني أبا طالب -.

( حم ق ) عن أبي سعيد.

**٨٠٢٠- بەڵكو تكاكردنی من سودی پێ بگەیەنێت لە ڕۆژی قیامەتدا و ، بخرێتە نێو نزمایيەك لە دۆزەخدا كە ئاگر تیایدا بگاتە پاژنەی و مێشكی پێوەی بكوڵێت – واتە : ئەبو تالیب .**

( الصحيحة ٥٤ )

٨٠٢١- ليخرجن قوم من أمتي من النار بشفاعتي يسمون الجهنميين.

( ت ه ) عن عمران بن حصين.

**٨٠٢١- كەسانێك بە شەفاعەتی من لە دۆزەخ دێتەدەر پێیان دەوترێت دۆزەخییەكان .**

( المشكاة ٢٥٨٥ )

٨٠٢٢- يدخل أهل الجنة الجنة و أهل النار النار ثم يقول الله عز و جل: أخرجوا من كان في قلبه مثقال حبة من خردل من إيمان فيخرجون منها قد اسودوا فيلقون في نهر الحياة فينبتون كما تنبت الحبة في جانب السيل ألم تر أنها تخرج صفراء ملتوية.

( ق ) عن أبي سعيد.

---

[1] بەڵێن پێدراوەكەش پێغەمبەرە ﷺ

**٨٠٢٢- خەڵكی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە و خەڵكی دۆزەخیش دەچنە دۆزەخەوە ،ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت : هەركەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك باوەڕ لە دڵیدا هەیە لە دۆزەخ دەریبهێنن ،ئیتر دەردەهێنرێت و ڕەشبوونەتەوە ،جا دەخرێنە ڕووباری ژیانەوە و ، سەوز دەبن بەوێنەی ڕوەكی لێواری ڕوبار ،ئایا بە نابینی زەردو لولی دەروێت .**

( السنة ٨٤٢ )

٨٠٢٣- يجمع المؤمنون يوم القيامة فيهتمون لذلك فيقولون: لو استشفعنا على ربنا فأراحنا من مكاننا هذا فيأتون آدم فيقولون: يا آدم ! أنت أبو البشر خلقك الله بيده و أسجد لك ملائكته و علمك أسماء كل شيء فاشفع لنا عند ربك حتى يريحنا من مكاننا هذا فيقول لهم آدم: لست هناكم و يذكر ذنبه الذي أصابه فيستحي ربه عز و جل من ذلك و يقول: و لكن ائتوا نوحا فإنه أول رسول بعثه الله إلى أهل الأرض فيأتون نوحا فيقول: لست هناكم و يذكر لهم خطيئة سؤاله ربه ما ليس له به علم فيستحي ربه من ذلك و لكن ائتوا إبراهيم خليل الرحمن فيأتونه فيقول: لست هناكم و لكن ائتوا موسى عبدا كلمه الله و أعطاه التوراة فيأتون موسى فيقول: لست هناكم و يذكر لهم النفس التي قتل بغير نفس فيستحي ربه من ذلك و لكن ائتوا عيسى عبد الله و رسوله و كلمته و روحه فيأتون عيسى فيقول لهم: لست هناكم و لكن ائتوا محمدا عبدا غفر الله له ما تقدم من ذنبه و ما تأخر فأقوم فأمشي بين سماطين من المؤمنين حتى استأذن على ربي فيؤذن لي فإذا رأيت ربي وقعت ساجدا لربي تبارك و تعالى فيدعني ما شاء أن يدعني ثم يقول: ارفع محمد قل يسمع و سل تعطه و اشفع تشفع فأرفع رأسي فأحمده بتحميد يعلمنيه ثم أشفع فيحد لي حدا فأدخلهم الجنة ثم أعود إليه الثانية فإذا رأيت ربي وقعت ساجدا لربي تبارك و تعالى فيدعني ما شاء الله أن يدعني ثم يقول: ارفع محمد ! قل يسمع و سل تعطه و اشفع تشفع فأرفع رأسي فأحمده بتحميد يعلمنيه ثم أشفع فيحد لي حدا فأدخلهم الجنة ثم أعود الثالثة فإذا رأيت ربي تبارك و تعالى وقعت ساجدا لربي فيدعني ما شاء أن يدعني ثم يقول: ارفع محمد ! قل يسمع و سل تعطه و اشفع تشفع فإذا رفعت رأسي فأحمده بتحميد يعلمنيه ثم أشفع فيحد لي حدا فأدخلهم الجنة ثم أعود الرابعة فأقول: يا رب ! ما بقي إلا من حبسه القرآن فيخرج من النار من قال: لا إله إلا الله و كان في قلبه من الخير ما يزن شعيرة ثم يخرج من النار من قال: لا إله إلا الله و كان في قلبه من الخير ما يزن برة ثم يخرج من النار من قال: لا إله إلا الله و كان في قلبه من الخير ما يزن ذرة.

( حم ق ن ه ) عن أنس.

٨٠٢٣- بڕواداران لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوە و ،تووشی پەژارەدەبن و ،دەڵێن : ئەگەر کەسێکمان بکردایا بە تکاکار لەلای پەروەردگارمان و ،ئاسوودەی بکردایەین لەم جێگایە ،ئیتر دێنە لای ئادەم و ،دەڵێن : ئەی ئادەم ! تۆ باوکی مرۆڤەکانی ،خوای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کردووی ،فریشتەکانیشی بۆ هێناویتە سوژدە و ،ناوی هەموو شتەکانی فێرکردوی ،بۆیە تکامان بۆبکە لای پەروەردگارت بەڵکو لەم جێگایە ڕزگارمان بکات ،ئەویش پێیان دەڵێت : لەو ئاستەدا نیم ،ئینجا باسی گوناهەکەی دەکات کە کردویەتی و شەرم دەکات لە پەروەردگاری و ،دەفەرموێت : بەلام بچنە لای نوح ،چونکە ئەو یەکەم [1] پێغەمبەرە ڕەوانەکراوە بۆ سەر زەوی ،ئەوانیش دەچنە لای نوح و ،دەڵێت : لەو ئاستەدا نیم و ،باسی ئەوەیان بۆدەکات چۆن داوای شتێکی کرد لە پەروەردگاری بە بێ زانست و ،شەرم لە پەروەردگاری دەکات ،بەلام بچنە لای ئیبراهیمی خۆشەویستی خوا ،ئەوانیش دەچنە لای و ،دەفەرموێت : لەو ئاستەدا نیم و،بەلام بچنە لای موسا ،ئەو بەندەیەکە خوای گەورە قسەی لەگەڵ کردووە و ،تەوراتی پێ بەخشیوە ، ئەوانیش دەچنە لای موسا و ،دەفەرموێت : لەو ئاستەدا نیم و ،ئینجا باسی ئەو پیاوە دەکات کە کوشتی بە بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێت و ،شەرم دەکات لە پەروەردگاری ،بەلام بچنە لای عیسا بەندەو پێغەمبەری خوایە و وشە و گیانی خۆیەتی ،ئینجا دەچنە لای عیسا و ،پێیان دەفەرموێت : لەوێ نیم و ،بەلام بچنە لای موحەممەد ،ئەو بەندەیەکە خوای گەورە لە گوناهی ڕابردوو داهاتوی خۆش بووە ،منیش هەڵدەستم و بە نێو بڕوادارانەوە تێپەڕدەبم ئینجا داوای مۆڵەت لە پەروەردگارم دەکەم و ،ئەویش مۆڵەتم دەدات ،کاتێك پەروەردگارم دەبینم سوژدەی بۆ دەبەم ،ئینجا ئەوەندەی دەیەوێت وازم لێ دەهێنێت ،دوایی دەفەرموێت : سەربەرز بکەرەوە موحەممەد ،قسە بکە گوێت لێ دەگیردرێت ،داوا بکە داوات جێ بەجێ دەکرێت ،تکا بکە تکات بەجێیە ،ئینجا سەرم بەرز دەکەمەوە و سوپاس و ستایشی دەکەم بەو شێوەیەی کە خۆی فێرم دەکات ،ئینجا شەفاعەت دەکەم و سنورێکم بۆ دادەنێت و ،دەیانخەمە بەهەشتەوە ،ئینجا جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆلای و ،کاتێك پەروەردگارم دەبینم سوژدەی بۆ دەم ،ئینجا ئەوەندەی کە

---

[1] یەکەم پەیامبەرە بە واتای دوای تۆفان یەکەم پێغەمبەرە یان هەر یەکەم (( رسول ))ە چونکە لە زمانی عەرەبیدلا (( نبی )) جیایە لەگەڵ (( رسول )) .

**دەیەوێت وازم لێ دەهێنێت ئینجا ،دەفەرموێت : سەرت بەرز کەرەوە ئەی موحەممەد ،قسە بکە گوێت لێ دەگیرێت ،داوا بکە داوات جێ بەجێ دەکرێت ،شەفاعەت بکە تکات بەجێیە منیش سەرم بەرز دەکەمەوەو ،سوپاس و ستایشی دەکەم بەو شێوەیەی خۆی فێرم دەکات ئینجا تکادەکەم و ،سنورێکم بۆ دیاری دەکات و ،دەیانخەمە بەهەشتەوە ،ئینجا بۆ جاری سێ یەم دەگەڕێمەوە ،جا کە پەروەردگارم دەبینم سوژدەی بۆ دەبەم و ،ئەوەندەی دەیەوێت لێم دەگەرێت و ،دەفەرموێت سەرت بەرز بکەرەوە ئەی موحممەد ! قسە بکە گوێت لێ دەگیرردرێت و ،داوابکە داوات جێ بەجێ دەکرێت و ،تکا بکە تکات بەجێیە ،جا کاتێك سەرم بەرز دەکەمەوە سوپاس و ستایشی دەکەم بەو شێوەیەی فێرم دەکات و، تکادەکەم و ،سنورێکم بۆ دیاری دەکات و ،دەیانخەمە بەهەشتەوە ،ئینجا بۆ چوارەم جار دەگەڕێمەوە دەڵێم : ئەی پەروەردگار ! کەس نەما ئەوانە نەبێت کە قورئان گیری داون ،ئیتر کەسێك وتبێتی** ( لاإله ألا الله ) **و ئەوەندەی دەنکە جۆیەك چاکە لە دڵیدا هەبێت لە دۆزەخ دەردەچێت و ئینجا کەسانێکی تر لە دۆزەخ دەردەهێنرێن کە وتبێتیان** ( لاإله ألا الله ) **وئەوەندنەی دەنکە گەنمێك چاکە لە دڵیاندا هەبێت ،ئینجا کەسانێك لە دۆزەخ دەردەهێنرێن کە وتبێتیان** ( لاإله ألا الله )**و بەئەندازەی گەردیلەیەك چاکە لە دڵیاندا بێت .**

( السنة ٨٠٤ )

٨٠٢٤- يجمع الله الناس يوم القيامة فيقوم المؤمنون حين تزلف لهم الجنة فيأتون آدم فيقولون: يا أبانا ! استفتح لنا الجنة فيقول: و هل أخرجكم من الجنة إلا خطيئة أبيكم آدم لست بصاحب ذلك اذهبوا إلى ابني إبراهيم خليل الله فيقول إبراهيم: لست بصاحب ذلك إنما كنت خليلا من وراء وراء اعمدوا إلى موسى الذي كلمه الله تكليما فيأتون موسى فيقول: لست بصاحب ذلك اذهبوا إلى عيسى كلمة الله و روحه فيقول عيسى لست بصاحب ذلك اذهبوا إلى محمد فيأتون محمدا فيقوم فيؤذن له و ترسل الأمانة و الرحم فتقومان جنبتي الصراط يمينا و شمالا فيمر أولكم كالبرق ثم كمر الريح ثم كمر الطير و شد الرجال تجري بهم أعمالهم و نبيكم قائم على الصراط يقول: يا رب سلم سلم حتى تعجز أعمال العباد و حتى يجيء الرجل فلا يستطيع السير إلا زحفا و في حافتي الصراط كلاليب معلقة مأمورة تأخذ من أمرت بأخذه فمخدوش ناج و مكدوس في النار.

( م ) عن أبي هريرة.

**٨٠٢٤- خواى گەورە خەڵكى كۆدەكاتەوە لە قيامەتدا، جا بڕواداران كاتێك بەهەشتيان لێ نزيك دەكرێتەوە هەڵدەستن و، دێنە لاى ئادەم و، دەڵێن:ئەى باوكمان :داوا بكە بەهەشتمان بۆ بكرێتەوە ،ئەويش دەفەرموێت: جا ئەگەر تاوانەكەى ئادەمى باوكتان نەبوايە ئێوە لە بەهەشت دەرنەدەكران؟ بۆ ئەو كارە ناشێم ،بچنە لاى ئيبراهيمى كوڕم كە خۆشەويستى خوايە، ئيبراهيم دەفەرموێت:بۆ ئەو كارە ناشێم ،من بومە خۆشەويست لە دواى دواوە ،بچنە لاى موسى كە خواى گەورە بە هەر قسە كردن قسەى لەگەڵ دەكرد،دەچنە لاى موساو دەفەرموێت، بەكەڵكى ئەو كارە نايەم، بچنە لاى عيسى ئەو وشەو (روح)ى خوايە، عيسا دەفەرموێت:ئەو كارە بە من ناكرێت، بچنە لاى موحەمەد، ئەوانيش دەچنە لاى موحەمەدو ،ئەويش هەڵدەستێت و ،مۆڵەتى پێدەدرێت،ئەمانەت و خزمايەتى لاى ڕاست و چەپى پردى (صراط)دا ڕادەگيرێن و، يەكەمتان وەكو بروسكە تێپەڕدەبێت وئينجا وەكو باى توندڕەو،ئينجا وەكو فڕينى باڵندە ئينجا وە ڕۆيشتنى پياوى تيژڕەو بە گوێرەى كردەوەكانيان دەڕۆن، كردەوەكانيان ڕێيان پێ دەكات و، پێغەمبەرەكەتان لەسەر پردەكە راوەستاوەودەڵێت:خوايە بە سەلامەتى ،تاكو كردەوەكان پەكيان دەكەوێت، تەنانەت پياوانى وا هەيە واى وايان لێ دێت ناتوانێت بڕوات بە سكەخشە نەبێت، لە هەردوو قەراغى پردەكەيش قولاپ هەڵواسراوە فەرمانى پێكراوە، ئەو كەسانە بگرێت كە فەرمانى پێكراوە بيانگرێت ،جا هەنديكيان برينداردەبن و ڕزگاريان دەبێت، هەنديكيشيان دەكەونە دۆزەخەوە.**

(المشكاة ٥٦٠٨)

٨٠٢٥- أنا سيد الناس يوم القيامة و هل تدرون مم ذلك ؟ يجمع الله الأولين و الآخرين في صعيد واحد يسمعهم الداعي و ينفذهم البصر و تدنو الشمس منهم فيبلغ الناس من الغم و الكرب ما لا يطيقون و لا يحتملون فيقول بعض الناس لبعض: ألا ترون ما قد بلغكم ؟ ألا تنظرون من يشفع لكم إلى ربكم ؟ فيقول بعض الناس لبعض: ائتوا آدم فيأتون آدم فيقولون: يا آدم أنت أبونا أنت أبو البشر خلقك الله بيده و نفخ فيك من روحه و أمر الملائكة فسجدوا لك اشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ؟ ألا ترى ما قد بلغنا ؟ فيقول لهم آدم: إن ربي قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله و لن يغضب بعده مثله و إنه نهاني عن الشجرة فعصيته نفسي نفسي نفسي اذهبوا إلى غيري اذهبوا إلى نوح " فيأتون نوحا فيقولون: أنت أول الرسل إلى أهل

الأرض و سماك الله ( عبدا شكورا اشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ؟ ألا ترى ما قد بلغنا ؟ فيقول لهم نوح: إن ربي قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله و لن يغضب بعده مثله و إنه قد كانت لي دعوة دعوت بها على قومي نفسي نفسي نفسي اذهبوا إلى غيري اذهبوا إلى إبراهيم " فيأتون إبراهيم فيقولون: يا إبراهيم ؟ أنت نبي الله و خليله من أهل الأرض اشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ؟ ألا ترى ما قد بلغنا ؟ فيقول لهم إبراهيم: إن ربي قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله و لن يغضب بعده مثله و إني قد كنت كذبت ثلاث كذبات نفسي نفسي نفسي اذهبوا إلى غيري اذهبوا إلى موسى " فيأتون موسى فيقولون: يا موسى ! أنت رسول الله فضلك الله برسالاته و بكلامه على الناس اشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ؟ ألا ترى ما قد بلغنا ؟ فيقول: إن ربي قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله و لن يغضب بعده مثله و إني قتلت نفسا لم أومر بقتلها نفسي نفسي نفسي اذهبوا إلى غيري اذهبوا إلى عيسى " فيأتون عيسى ! فيقولون: يا عيسى أنت رسول الله و كلمته ألقاها إلى مريم و روح منه و كلمت الناس في المهد اشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ؟ ألا ترى ما قد بلغنا ؟ فيقول لهم عيسى: إن ربي قد غضب اليوم غضبا لم يغضب قبله مثله و لن يغضب بعده مثله نفسي نفسي نفسي اذهبوا إلى غيري اذهبوا إلى محمد " فيأتوني فيقولون: يا محمد ! أنت رسول الله و خاتم الأنبياء و غفر الله لك ما تقدم من ذنبك و ما تأخر اشفع لنا إلى ربك ألا ترى ما نحن فيه ؟ ألا ترى ما قد بلغنا ؟ " فأنطلق فآتي تحت العرش فأقع ساجدا لربي ثم يفتح الله علي و يلهمني من محامده و حسن الثناء عليه شيئا لم يفتحه لأحد قبلي ثم يقال: يا محمد ! ارفع رأسك سل تعط و اشفع تشفع فأرفع رأسي فأقول: يا رب ! أمتي أمتي فيقال: يا محمد أدخل الجنة من أمتك من لا حساب عليه من الباب الأيمن من أبواب الجنة و هم شركاء الناس فيما سوى ذلك من الأبواب و الذي نفسي بيده إن ما بين مصراعين من مصاريع الجنة لكما بين مكة و هجر أو كما بين مكة و بصرى ) .

( حم ق ت ) عن أبي هريرة .

**٨٠٢٥- من سەرداری خەڵكیم لە ڕۆژی قیامەتدا، دەزانن بەهۆی چیە ئەوە؟ خوای گەورە پێشینان و دواییینان كۆدەكاتەوە لەیەك دەشتایدا، دەنگی جاڕدەر دەبیسن و، چاو دەیانبینێ، خۆریان لێ نزیك دەبێتەوە، ئیتر خەڵكی تووشی خەم و ناڕەحەتیەكی لە توانا بەدەر دەبن، خەڵكی بەیەكتر دەڵێن: ئایا نابینن چیتان بەسەر هاتووە ؟ئەوە بۆ**

ورد نابنەوە كەسێك تكاتان بۆ بكات لەلاى پەروەردگارتان ؟ئینجا خەڵكەكە هەندێكیان بە هەندێكیان دەڵێن: بچنە لاى ئادەم، ئیتر دەچنە لاى ئادەم و دەڵێن: ئەى ئادەم تۆ باوكمانى باوكى هەموو مرۆڤەكانى، خواى گەورە بە دەستى خۆى دروستى كردووى و، لە( رۆح )ى خۆى پیاكردوویت و، فەرمانیشى بە فریشتەكان كردووە سوژدەیان بۆبردوى.تكامان بۆبكە لەلاى پەروەردگارت ، ئایا نابینى ئێمە لە چ حاڵێكداین؟ ئایا نابینى بە چى حاڵێك گەیشتووین؟ ئادەم پێیان دەفەرموێت :پەروەردگارم ئەمرۆیە شێوەیەك تووڕەبووە ،نە لەمەو پێش و نە لەمەودوا هەرگیز بەو شێوە تووڕە نەبوومو نابێت، ئەو دارەكەى لێ قەدەغە كردم ومنیش سەرپێچیم كرد، هەر خۆم خۆم خۆم [1] ، بچنە لاى كەسێى تر ئەوانیش دەچنە لاى نوح ودەڵێن: تۆ یەكەمین پێغەمبەرى بۆسەر زەوى، خواى گەورەش ناوى ناوە( عبدا شكورا ) { الاسراء ٣: }بەندەى سوپاسگوزار لەلاى پەروەردگارت تكامان بۆ بكە ،ئایا نابینى لە چ حاڵێكداین و ؟ بە چ حاڵێك گەیشتووین؟ نوح دەفەرموێت : پەروەردگارم ئەمڕۆ بە شێوەیەك تووڕە بووە نە لەمەوپێش و نە لەمەودوا هەرگیز بەو شێوەیە تووڕە نەبوومو نابێت ،منیش پاڕانەوەیەكم دژى میللەتەكەم بەكار هێنا و ،ئەمڕۆ هەر خۆم خۆم خۆم ،بچنە لاى كەسێكى تر ،بچنە لاى ئیبراهیم ،ئەوانیش دەچنە لاى ئیبراهیم و ،دەڵێن : ئەى ئیبراهیم ؟ تۆ پێغەمبەرى خواو خۆشەویستى ئەوى لەناو خەڵكى لەسەر زەویدا ،شەفاعەتمان بۆبكە لەلاى پەروەردگارت ،ئایا نابینى لە چ حاڵێكداین و بە چ حاڵێك گەیشتین ؟ ئیبراهیم پێیان دەفەرموێت : پەروەردگارم ئەمڕۆ بە شێوەیەك تووڕە بووە نە لەمەوپێش و نە لەمەودوا هەرگیز بەو شێوەیە تووڕە نەبوومو نابێت ،منیش سێ درۆم كردووە و ،ئەمڕۆ لە هەر خۆم خۆم خۆم ،بچنە لاى كەسێكى تر ،بچنە لاى موسا ،دەچنە لاى موسا و ،دەڵێن : ئەى موسا ! تۆ پێغەمبەرى خواى ،خواى گەورە تۆى پەسەند كردووە وپلەى بەرز كردوونەتەوە بەسەر خەڵكیدا بە پەیامەكانى و ،بە قسەكردنى لە تەكتا ، دەى تكامان بۆ بكە لە لاى پەروەردگارت ئایا نابینى لە چ حاڵێكداین و ،بە چ حاڵێك گەیشتووین ؟ ئەویش دەفەرموێت : پەروەردگارم ئەمڕۆ بە شێوەیەك تووڕە بووە نە نە لەمەوپێش و نەلەمەودوا هەرگیز بەو شێوەیە تووڕەنەبوومو نابێت،منیش كەسێكم

[1] واتە : هەر لە غەمى و داوا دەكەم خۆم رشزگارم بێت و تكام بۆ كەس پێ ناكرێت .

**كوشتووە بىٚ ئەوەى فەرمانم پێبكرێت و ،هەر خۆم خۆم خۆم ،بچنە لاى عيسا ،دەچنە لاى عيسا ! دەڵێن : ئەى عيسا تۆ پێغەمبەرى خواى و وشەيەكى ئەوى ناردوويتى بۆلاى مەريەم و ( روح )ێكى لەلاى خۆيەوە ،لەسەر لانك و لەناو بێشكەدا قسەت لەگەڵ خەڵكى دەكرد لە ،تكامان بۆ بكە لەلاى پەروەردگارت ،ئايا نابينى لە چ حاڵێكداين و بە چ حاڵێك گەيشتووين ؟ عيسا پێيان دەلفەرموێت : پەروەردگارم ئەمڕۆ بە شێوەيەك تووڕە بووە نە نە لەمەوپێش و نە لەمەودوا بەو شێوەيە تووڕە نەبووە نابێت ،هەر خۆم خۆم خۆم بچنە لاى كەسێكى تر ،بچنە لاى موحەممەد ! دەچنە لاى و دەڵێن : ئەى موحەممەد تۆ پێغەمبەرى خوايت و ،كۆتايى پێغەمبەرانى ،خواى گەورەيش لە هەموو گوناهەكانى ڕابوردو و داهاتوت و دواترت خۆش بووە ،تكامان بۆ بكە لەلاى پەروەردگارت ئايا نابينى لە چ حاڵێكداين و ،بە چ حاڵێك گەيشتووين ؟ منيش دەچم و لەژێر عەرشدا سوجدە دەبەم بۆ پەروەردگارم ،ئينجا خواى گەورە مۆڵەتم دەدات و ، جۆرەها شێوازى سوپاس و ستايشم فێر دەكات كە پێشتر فێرى نەكردبووم ،ئينجا دەوترێت ئەى موحەممەد ! سەرت بەرزبكەرەوە ،داوا بكە داواكاريت جىٚ بە جىٚ دەكرێت و ،شەفاعەت بكە تكات بەجێيە،منيش سەر بەرز دەكەمەوە و ،دەڵێم : پەروەردگارم ! ئوممەتەكەم ،ئوممەتەكەم ،ئينجا دەوترێت : ئەى موحەممەد ،ئەوانەى لێپرسينەوەيان لەسەر نييە لە ئوممەتەكەت بيانخەرە بەهەشتەوە لە دەرگاكانى لاى ڕاستى بەهەشتەوە ،ئەوان هاوبەشن لەگەڵ خەڵكى لە دەرگاكانى تريشدا ،سوێند بەوەى گيانى منى بەدەستە نێوان هەردوو لاشيپانى دەرگاكانى بەهەشت ئەوەندەى ماوەى نێوان مەككەو هەجەرە ،يان وەكو ماوەى نێوان مەككە و بوسرايە .**

( الطحاوية ٢٩٢ )

٨٠٢٦- إذا كان يوم القيامة شفعت فقلت: يا رب أدخل الجنة من كان في قلبه خردلة من إيمان فيدخلون ثم يقول: أدخل الجنة من كان في قلبه أدنى شيء.

( خ ) عن أنس .

**٨٠٢٦- لە ڕۆژى قيامەت شەفاعەت دەكەم و دەڵێم : پەروەردگارم هەركەسێك بە ئەندازەى گەرديلەيەك ئيمانى لە دڵدايە بيخەيتە بەهەشتەوە ،ئيتر دەچنە بەهەشتەوە و ،ئينجا خواى گەورە دەفەرموێت : هەركەسێك لەوەش كەمتر ئيمانى لە دڵدايە با بچێتە بەهەشتەوە .**

٨٠٢٧- أنا أول الناس يشفع في الجنة و أنا أكثر الأنبياء تبعا.

( م ) عن أنس .

**٨٠٢٧- من یەکەمین کەسم کە لە بەهەشتدا شەفاعەت دەکات ،من خاوەنی زۆرترین شوێن کەوتوانیشم لە نێو پێغەمبەراندا .**

( الصحيحة ١٥٧٠ )

٨٠٢٨- أنا أول شفيع في الجنة لم يصدق نبي من الأنبياء ما صدقت و إن من الأنبياء نبيا ما يصدقه من أمته إلا رجل واحد.

( م ) عن أنس .

**٨٠٢٨- من یەکەم تکا کارم لە بەهەشتدا ،هیچ پێغەمبەرێك ئەوەندەی من باوەڕی پێنەکراوە ، پێغەمبەری واش هەیە لە پیاوێك زیاتر لە ئوممەتەکەی ئیمانی پێ ناهێنێت .**

( الصحيحة ١٥٧٠)

٨٠٢٩- ليصيبن ناسا سفع من النار عقوبة بذنوب عملوها ثم يدخلهم الله الجنة بفضل رحمته فيقال لهم: الجهنميون.

( حم خ ) عن أنس.

**٨٠٢٩- بێگومان کەسانێك داخدەکرێن بە ئاگر وەکو سزایەك بە تاوەنگەلێك کە کردوویانەو ،ئینجا خوای گەورە دەیان خاتە بەهەشتەوە بە چاکەو میهرەبانی خۆی و ، پێیان دەوترێت دۆزەخیەکان .**

( ظلال الجنة ٨٤٥ )

## بابەتی شێوەو خۆشگوزەرانی بەهەشت

٨٠٣٠- آتى باب الجنة يوم القيامة فأستفتح فيقول الخازن: من أنت ؟ فأقول محمد فيقول: بك أمرت أن لا أفتح لأحد قبلك .

( حم م ) عن أنس .

**٨٠٣٠- دەچمە دەرگای بەهەشت[1] لە ڕۆژی قیامەتدا و لەدەرگا دەدەم و ،دەرگاوانەکە دەڵێت : تۆ کێی ؟ منیش دەڵێم : موحەممەد م[2] ئەویش دەڵێت : فەرمانم پێکراوە دەرگا بۆ کەس نەکەمەوە لە پێش تۆدا .**

( الصحيحة ٧٧٤ )

٨٠٣١- آخر من يدخل الجنة رجل يمشي على الصراط فهو يمشي مرة و يكبو مرة و تسفعه النار مرة فإذا جاوزها التفت إليها فقال تبارك الذي نجاني منك لقد أعطاني الله شيئا ما أعطاه أحدا من الأولين و الآخرين فترفع له شجرة فيقول أي رب أدنني من هذه الشجرة فلأستظل بظلها و أشرب من مائها فيقول الله يا ابن آدم لعلي إن أعطيتكها سألتني غيرها ؟ فيقول لا يا رب و يعاهده أن لا يسأله غيرها و ربه يعذره لأنه يرى ما لا صبر له عليه فيدنيه منها فيستظل بظلها و يشرب من مائها ثم ترفع له شجرة أخرى هي أحسن من الأولى فيقول أي رب أدنني من هذه لأشرب من مائها و أستظل بظلها لا أسألك غيرها فيقول يا ابن آدم ألم تعاهدني ألا تسألني غيرها ؟ فيقول لعلي إن أدنيتك منها تسألني غيرها ؟ فيعاهده أن لا يسأله غيرها و ربه يعذره لأنه يرى ما لا صبر له عليه فيدنيه منها فيستظل بظلها و يشرب من مائها ثم ترفع له شجرة عند باب الجنة و هي أحسن من الأوليين فيقول أي رب أدنني من هذه فلأستظل بظلها و أشرب

---

[1] ( ابن القيم ) دەڵێت : حەڤدە دەرگای هەیە ،زۆری ناوەکان بەرزی ناو نراوەکە دەگەیەنێت ،یەکەمین وشەی ( الجنه ) یە کە ئاماژە بۆ ئەو جێگایە پڕ لە خۆشی و خۆشگوزەرانی و ئاسوودەییە دەکات و ،ئینجا ( دار السلام ) واتە : سەلامەتی لە هەموو بەلأیەك و ، ( دار الخلد )و ( دار الاقمه )و ( جنه الماوی )و ( جنه عدن )و ( الفردوس ) کە جار جارە بە هەموو بەهەشت دەوترێت جارە جارەیش بەتەنها سەرەوەی دەوترێت ،هەروەها ( جنه النعیم ) و ( المقام الامین )و ( مقعد صدق )و ( قدم صدق )و ...ناوی تر .

[2] ئەوەوی دەڵێت : قەیناکە کەسێك بڵێت : من مامۆستا فلأن کەسم ،یان قازی فلأنم ،ئەگەر بەوە نەبێت نەدەناسرا ،لە حاڵەتێکدا خۆبەزل زانینی تیا نەبێت .

من مائها لا أسألك غيرها فيقول يا ابن آدم ألم تعاهدني أن لا تسألني غيرها ؟ قال بلى يا رب أدنني من هذه لا أسألك غيرها و ربه يعذره لأنه يرى ما لا صبر له عليه فيدنيه منها فإذا أدناه منها سمع أصوات أهل الجنة فيقول: أي رب أدخلنيها فيقول: يا ابن آدم ما يعريني منك ؟ أيرضيك أن أعطيك الدنيا و مثلها معها ؟ فيقول: أي رب أتستهزئ مني و أنت رب العالمين ؟ فيقول: إني لا أستهزئ منك و لكني على ما أشاء قادر .

( حم م ) عن ابن مسعود.

**٨٠٣١- دواترين كەس دەچێتە بەهەشتەوە پیاوێکە بەسەر پردی ( صراط )دا دەڕوات، جارێك دەڕوات و جارێك بە دەممدا دەکەوێت و جارێکیش ڕوخساری هەڵدەقرچێنێت ،جا کاتێك تێدەپەڕێت و ئاوڕدەداتەوە دەڵێت : فەڕو پیرۆزی بۆ ئەو خوایەی لە تۆ ڕزگاری کردم ،لە ڕاستیدا خوای گەورە شتێکی بەمن بەخشیوە بە کەسی نەداوە لە پێشینان ولە پاشینان ،دەڵێت : پەروەردگارم لەو درەختە نزیکم بکەرەوە ، بەڵکو لە سێبەرەکەی دانیشم و ،لە ئاوەکەی بخۆمەوە ،خوای گەورە دەفەرموێت : ئەی ئادەمیزاد لەوانەیە ئەگەر ئەوەت پێبدەم داوای شتی ترم لێ بکەی ؟دەڵێت : نەخێر پەروەردگارم و، پەیمانی پێدەدات داوای هیچی تری لێ نەکات ، پەروەردگاریشی بیانوی لێ دەگرێت ،چونکە دەزانێ ئارامی ناگرێت لەسەری ،ئیتر لێی نزیك دەکاتەوە و دەچێتە سێبەرەکەی و ،لە ئاوەکەی دەخواتەوە ،ئینجا درەختێکی تر دەبینێت لە داری یەکەم چاکترە ،دەڵێت : ئەی پەروەردگارم نزیکم بکەرەوە لەو درەختە ،لە ئاوەکەی بخۆمەوە و لە سێبەرەکەی دانیشم ،ئیتر داوای هیچی ترت لێ ناکەم ،دەفەرموێت : ئەی ئادەمیزاد ئایا پەیمانت پێ نەدام هیچی ترم لێ داوا نەکەیت؟ دەفەرموێت : لەوانیە ئەگەر نزیکت بکەمەوە لێی داوای شتی ترم لێ بکەی ؟ ئیتر پەیمانی پێ دەدات کە داوای شتی تری لێ نەکات ، پەروەردگاریش بیانوی لێ دەگرێت ،چونکە شتێك دەبینێت ناتوانێت ئارامی لەسەر بگرێت ،ئینجا نزیکی دەکاتەوە لێی و ، دادەنیشێ لە سێبەرەکەی و ،لە ئاوەکەی دەخواتەوە ،ئینجا درەختێکی لە دەرگای بەهەشتدا نیشان دەدرێت ،چاکترە لە دوو درەختەکەی تر ،دەڵێت پەروەردگارم لەو درەختە نزیکم بکەرەوە ،لە سێبەرەکەیدا دانیشم و لە ئاوەکەی بخۆمەوە ،ئیتر داواکاریم نیە دوای ئەوە ،خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد پەیمانت پێ نەدام داوای شتی ترم لێ نەکەیت ؟ دەڵێت : بەڵێ پەروەردگارم ،لەوە نزیکم بکەرەوە ،داوای هیچی ترت لێ ناکەم ئیتر ، پەروەردگاریش بیانوی لێ وەردەگرێت ، چونکە شتێك دەبینێت ئۆقرە ناگرێت بۆی ،ئینجا نزیکی دەکاتەوە لێی ،جا کە نزیك**

**دەبێتەوە ،گوێی لە دەنگی خەڵکی بەهەشت دەبێت و ، دەڵێت: پەروەردگارم با بچمە ژوورەوە، دەفەرموێت : ئەی ئادەمیزاد بەچی ڕازی دەبیت کە ئیتر داوای هیچ نەکەیت ؟ ،ئایا بەوە ڕازی دەبیت دوو ئەوەندەی دونیات پێ ببەخشم ؟ دەڵێت :ئێی خوایە ئایا گاڵتەم پێ دەکەیت و ، کە تۆ پەروەردگاری جیهانەکانی ؟ دەفەرموێت : من گاڵتەت پێ ناکەم ،بەڵکو ئەوەی بمەوێت دەتوانم لەسەر جێ بەجێی بکەم .**

( الصحيحة ٢٦٠١ )

٨٠٣٢- أتعلم ؟ أول زمرة تدخل الجنة من أمتي فقراء المهاجرين يأتون يوم القيامة إلى باب الجنة و يستفتحون فيقول لهم الخزنة: أو قد حوسبتم ؟ قالوا: بأي شيء نحاسب و إنما كانت أسيافنا على عواتقنا في سبيل الله حتى متنا على ذلك ؟ فيفتح لهم فيقيلون فيها أربعين عاما قبل أن يدخلها الناس.

( ك هب ) عن ابن عمرو .

**٨٠٣٢- ئايا دەزانیت ؟ یەکەم دەستە دەچنە بەهەشتەوە لە ئوممەتەکەم کۆکردە هەژارەکانن، لە ڕۆژی قیامەتدا دێنە بەر دەرگای بەهەشت و داوا دەکەن بۆیان بکرێتەوە و ،دەرگاوانەکان دەڵێن : ئایا لێپرسینەوەتان لەگەڵ کرا ؟ دەڵێن : لێپرسینەوەی چیمان لەگەڵ بکرێت ، شمشێرەکانمان بە شانمانەوە بوو ،تاکو لەسەر ئەو ڕێبازە مردین ؟ ئیتر بۆیان دەکرێتەوە ،و چل ساڵ تیایدا دەمێننەوە ، پێش ئەوەی خەڵکی بچنە ژوورەوە.**

( الصحيحة ٨٥١ )

٨٠٣٣- إذا خلص المؤمنون من النار حبسوا بقنطرة بين الجنة و النار فيتقاصون مظالم كانت بينهم في الدنيا حتى إذا نقوا و هذبوا أذن لهم بدخول الجنة فوالذي نفس محمد بيده لأحدهم بمسكنه في الجنة أدل منه بمسكنه كان في الدنيا

( حم خ ) عن أبي سعيد .

**٨٠٣٣- کاتێك بڕواداران لە دۆزەخ ڕزگاریان دەبێت لە پردێکدا گیر دەدرێن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ،ئیتر لەوێ بەسەرهاتی هەندێ ستەمی دونیا دەگێڕنەوە کە لە نێوانیاندا ڕوویداوە ،کاتێك پاك و خاوێن دەبنەوە ئینجا ڕێگەیان پێ دەدرێت بچنە بەهەشتەوە ،سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ،لە ماڵەکەی بەهەشتیان زیاتر شارەزان وەك لە ماڵەکەی دونیایان .**

( ظلال الجنة ٨٥٧ )

٨٠٣٤- إذا دخل أهل الجنة الجنة و أهل النار النار يجاء بالموت كأنه كبش أملح فيوقف بين الجنة و النار فيقال: يا أهل الجنة هل تعرفون هذا ؟ فيشرئبون فينظرون و يقولون: نعم هذا الموت و كلهم قد رآه ثم ينادى: يا أهل النار هل تعرفون هذا ؟ فيشرئبون فينظرون فيقولون: نعم هذا الموت و كلهم قد رآه فيؤمر به فيذبح و يقال: يا أهل الجنة خلود و لا موت و يا أهل النار خلود و لا موت.

( حم ق ت ه ) عن أبي سعيد .

**٨٠٣٤- كاتێك خەڵكی بەهەشت دەچنە بەهەشت و ،خەڵكی دۆزەخ دەچنە دۆزەخەوە ، مردن دەهێنرێت هەردەڵێی بەرانی قەڵەوە ،لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەوەستێنرێت، ئینجا دەوترێت : ئەی خەڵكی بەهەشت ،ئایا ئەوە دەناسن ؟ئەوانیش سەر بەرز دەكەنەوەو دەڕوانن و ،دەڵێن بەڵێ ئەوە مردنە ،هەمووشیان دەیبینن ،ئینجا بانگ دەكرێت ئەی خەڵكی دۆزەخ ،ئایا ئەوە دەناسن ؟ ئەوانیش سەر بەرز دەكەنەوەو دەڕوانن و ،دەڵێن : بەڵێ ئەوە مردنە ،هەمووشیان دەیبینن ،ئینجا فەرمان دەكرێت سەردەبڕدرێت و ،دەوترێت : ئەی خەڵكی بەهەشت ئیتر نەمریە و مردن نەما ،ئەی خەڵكی دۆزەخ ئیتر نەمریە و ،مردن نەما .**

( الترغيب ٣٧٧٢ )

٨٠٣٥- إذا دخل أهل الجنة الجنة يقول الله تعالى: تريدون شيئا أزيدكم ؟ فيقولون: ألم تبيض وجوهنا ؟ ألم تدخلنا الجنة و تنجنا من النار ؟ فيكشف الحجاب فما أعطوا شيئا أحب إليهم من النظر إلى ربهم.

( م ت ) عن صهيب .

**٨٠٣٥- كاتێك خەڵكی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە ،خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا شتێكی لەوە زیاترتان دەوێت تا بتان دەمێ ؟ ئەوانیش دەڵێن : ئایا ڕووت سپی نەكردین؟ ئایا نەتخستینە بەهەشتەوە و ،لە دۆزەخ ڕزگارت نەكردین ؟ ئینجا خوای گەورە پەردە لادەبات ،ئیتر بۆیان دەردەكەوێت خۆشتریان پێ نەبەخشراوە كە تەماشاكردنی پەروەردگاریانە .**

( المشكاة ٥٦٥٦ )

٨٠٣٦- إذا دخل أهل الجنة الجنة يقول الله عز و جل: هل تشتهون شيئا فأزيدكم ؟ فيقولون: ربنا و ما فوق ما أعطيتنا ؟ فيقول: رضواني أكبر.

( ك ) عن جابر .

**٨٠٣٦- کاتێك بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە ،خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا حەزتان لە شتێکی تر هەیە تا پێتان ببەخشم ؟ ئەوانیش دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان لەوە زیاتر چی هەیە کە پێت بەخشیوین ؟خوا دەفەرموێت : ڕەزامەندیم لەوەش گەورەترە .**

( الصحيحة ١٣٣٦ )

٨٠٣٧- إذا صار أهل الجنة إلى الجنة و أهل النار إلى النار جيء بالموت حتى يجعل بين الجنة و النار ثم يذبح ثم ينادي مناد: يا أهل الجنة خلود لا موت يا أهل النار خلود لا موت فيزداد أهل الجنة فرحا إلى فرحهم و يزداد أهل النار حزنا إلى حزنهم.

( حم ق ) عن ابن عمر .

**٨٠٣٧- کاتێك خەڵکی بەهەشت دەگەنە بەهەشت و ،خەڵکی دۆزەخ دەگەنە دۆزەخ ،مردن دەهێنرێت هەتا دەخرێتە نێوان بەهەشت و دۆزەخەوە ،ئینجا سەر دەبڕدرێت و ، جاڕدەرێك بانگ دەکات : ئەی خەڵکی بەهەشت ئیتر بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە و ، نامرن ،ئەی خەڵکی دۆزەخ بۆ هەتا هەتا یە دەمێننەوەو ،نامرن ،ئیتر بەهەشتیەکان ئەوەندەی تر خۆشحاڵ دەبن و ،دۆزەخییەکانیش ئەوەندەی تر خەمبار دەبن .**

( الضعيفة ٢٦٦٩ )

٨٠٣٨- أربعة أنهار من أنهار الجنة سيحان و جيحان و النيل و الفرات.

( الشيرازي في الألقاب ) عن أبي هريرة .

**٨٠٣٨- چوار ڕووبار لە ڕووبارەکانی بە هەشتن : سیحان و ،جیحان و،نیل و ،فورات .**

( الصحيحة ١١٠ )

٨٠٣٩- أرض الجنة خبزة بيضاء.

( أبو الشيخ في العظمة ) عن جابر .

**٨٠٣٩- خاکی بەهەشت وەکو نانی سپی یە .**

( الصحيحة ١٤٣٨ )

٨٠٤٠- أطفال المشركين خدم أهل الجنة.

( طس ) عن أنس ( ص ) عن سلمان موقوفا .

**٨٠٤٠- منالّى بت پەرستان خزمەتكارى خەڵكى بەهەشتن .**

( الصحيحة ١٤٦٨ )

٨٠٤١- اطلعت في الجنة فرأيت أكثر أهلها الفقراء واطلعت في النار فرأيت أكثر أهلها النساء.

( حم م ت ) عن ابن عباس ( خ ت ) عن عمران بن حصين .

**٨٠٤١- تەماشاى بەهەشتم كرد زۆربەى خەڵكەكەى لە هەژاران بوون ،سەيرى دۆزەخيشم كرد زۆربەى خەڵكەكەى ئافرەتـان بوون .**

( الضعيفة ٢٨٠٠ )

٨٠٤٢- أعطيت سبعين ألفا من أمتي يدخلون الجنة بغير حساب وجوههم كالقمر ليلة البدر قلوبهم على قلب رجل واحد فاستزدت ربي عز و جل فزادني مع كل واحد سبعين ألفا.

( حم ) عن أبي بكر .

**٨٠٤٢- حەفتا هەزار كەس لە ئوممەتەكەم لەبەر من بەخشراون ،دەچنە بەهەشتەوە بە بێ لێپرسينەوە ،ڕووخسـاريـان وەكو مانگى چواردەيە ،دڵەكانيـان وەكو يەك دڵ وايە ،داواى زياتـرم كرد لە پەروەردگارم ،ئەويش لەگەڵ هەريەك لەوانە حەفتا هەزارى تـرى پێ بەخشيم .**

( الصحيحة ١٤٨٤ )

٨٠٤٣- أنا أكثر الأنبياء تبعا يوم القيامة و أنا أول من يقرع باب الجنة

( م ) عن أنس .

**٨٠٤٣- من لە هەموو پێغەمبەران شوێن كەوتووم زۆرتـرە لە ڕۆژى قيامەتدا من يەكەم كەسيشم لە دەرگاى بەهەشت دەدەم .**

( الصحيحة ١٥٧٠ )

٨٠٤٤- أنا أول من يأخذ بحلقة باب الجنة فأقعقعها

( حم ت ) عن أنس .

**٨٠٤٤- من يەكمين كەسم قوڵفى دەرگاى بەهەشت دەگرم و ،لە دەرگاكە دەدەم .**

( الصحيحة ١٥٧٠ )

٨٠٤٥- إن أدخلت الجنة أتيت بفرس من ياقوتة لها جناحان فحملت عليه ثم طار بك حيث شئت.

( ت ) عن أبي أيوب .

**٨٠٤٥-ئەگەر بخرێتە بەهەشت ئەسپێكت بۆ دەهێنن لە یاقووت دوو باڵی هەیە ،هەڵتگرێت و ،هەڵتدەفڕێنێ بۆ هەر كوێ ئارەزوو بكەیت .**

( الصحيحة ٣٠٠١ )

٨٠٤٦- إن يدخلك الله الجنة فلا تشاء أن تركب فرسا من ياقوتة حمراء تطير بك في أي الجنة شئت إلا ركبت.

( حم ت ) عن بريدة .

**٨٠٤٦- ئەگەر خوای گەورە بت خاتە بەهەشتەوە و ،حەز ناكەیت سواری ئەسپێك بیت كە لە یاقووتی سوور بێت و بۆ هەر جێگایەكی بەهەشت حەزبكەیت ،سوار بیت و بتبات.**

( الترغيب ٣٧٥٦ )

٨٠٤٧- إن أدنى أهل الجنة منزلا رجل صرف الله وجهه عن النار قبل الجنة و مثل له شجرة ذات ظل فقال: أي رب قدمني إلى هذه الشجرة فأكون في ظلها فقال الله: هل عسيت أن تسألني غيره ؟ قال: لا و عزتك فقدمه الله إليها و مثل له شجرة ذات ظل و ثمر فقال: أي رب قدمني إلى هذه الشجرة فأكون في ظلها و آكل من ثمرها فقال الله: هل عسيت إن أعطيتك ذلك أن تسألني غيره ؟ فيقول: لا و عزتك فيقدمه الله إليها فيمثل الله له شجرة أخرى ذات ظل و ثمر و ماء فيقول: أي رب قدمني إلى هذه الشجرة فأكون في ظلها و آكل من ثمرها و أشرب من مائها فيقول له: هل عسيت إن فعلت أن تسألني غيره ؟ فيقول: لا و عزتك لا أسألك غيره فيقدمه الله إليها فيبرز له باب الجنة فيقول: أي رب قدمني إلى باب الجنة فأكون تحت سجاف الجنة فأرى أهلها فيقدمه الله إليها فيرى الجنة و ما فيها فيقول: أي رب أدخلني الجنة فيدخل الجنة فإذا دخل الجنة قال: هذا لي ؟ فيقول الله له: تمن فيتمنى و يذكره الله عز و جل سل من كذا و كذا حتى إذا انقطعت به الأماني قال الله: هو لك و عشرة أمثاله ثم يدخله الله الجنة فيدخل عليه زوجتاه من الحور العين فيقولان: الحمد لله الذي أحياك لنا و أحيانا لك فيقول: ما أعطي أحد مثل ما أعطيت و أدنى أهل النار عذابا ينعل من نار بنعلين يغلي دماغه من حرارة نعليه.

( حم م ) عن أبي سعيد .

٨٠٤٧- بەڕاستى نزمترين پلەى ئەهلى بەهەشت بۆ پياوێكە خواى گەورە لە دۆزەخ ڕزگارى كردووە و ،ديمەنێكى درەختێكى سێبەردارى دەكەوێتە بەر چاو ،ئينجا دەڵێت : پەروەردگارم بمنێرە لاى ئەو درەختە ،با لە سێبەرەكەيدا بم ،خواى گەورە دەفەرموێت : ئايا دواى ئەوە داوا كارى تر ناكەيت ؟ دەڵێ : نەخێر ،سوێند بە شكۆداريت ،خواى گەورە دەينێرێتە ژێر ئەو درەختە ،ئينجا ديمەنى درەختێكى تر دەبينێ سێبەرو بەرو بوومى هەيە ،دەڵێت : پەروەردگارم بمنێرە لاى ئەو درەختە بەڵكو بچمە سێبەرەكەى و ،لە بەرو بوومەكەى بخۆم ،خواى گەورە دەفەرموێت : ئايا ئەگەر ئەوەت پێ ببەخشم ،داواى هيچى ترم لێ ناكەيت ؟ دەڵێت : نە سوێند بە شكۆداريت ،ئيتر خواى گەورە دەينێرێت ، ئينجا درەختێكى تر دەبينێت ، سێبەرو بەرووبووم و ئاوى لەلاوەيە ،دەڵێت : پەروەردگارم بمنێرە لاى ئەو درەختە ،بەڵكو لە سێبەرەكەيدا پشوو بدەم و لە بەرو بووم و ئاوەكەى بخۆم و بخۆمەوە ،خواى گەورە دەفەرموێت : ئايا ئەگەر ئەوەت بۆ بكەم داواى شتى ترم لێ ناكەيت ؟ دەڵێت : نەخێر ،سوێند بە شكۆ داريت ،داواى هيچى ترت لێ ناكەم جارێكى تر ،ئيتر خواى گەورە دەينێرێتە لاى ئەو دارە ،لەوێ وە دەرگاى بەهەشتى لێوە ديار دەبێت و ،دەڵێت : پەروەردگارم نزيكم بكەرەوە لە دەرگاى بەهەشت بالاى دەرگاكەوە بم و خەڵكەكەيم لێوە ديار بێت ،ئيتر خواى گەورە پێشى دەخات بۆ ئەوێ و ، بەهەشت دەبينێ ،جا دەڵێت: پەروەردگارم بمخەرە بەهەشتەوە ،ئيتر دەچێتە بەهەشتەوە ،ئەو كاتە دەڵێ: ئايا ئەوە بۆ منە ؟خواى گەورە پێى دەفەرموێت :خۆزگە بخوازە ئەويش خۆزگە دەخوازێت و خواى گەورە بيرى دەخاتەوە ئەومو ئەوە داوا بكە ، كاتێك هيچ نامێنێت داواى بكات ، خواى گەورە پێى دەفەرموێت: ئەوەندەو ئەوەندەى تر بۆ تۆيە. ئينجا دەيخاتە بەهەشتەوە ،ئيتر هەردوو خێزانە حۆريەكانى دێنە لاىو دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوايەى كە تۆى بۆ ئێمە دروست كردووە و ، ئێمەى بۆ تۆ دروست كردووە، ئەوسا دەڵێت: كەس ئەوەندەى منى پێ نەبەخشراوە ئاسانترين سزايش بۆ دۆزەخيەكان كەسێكە دوو كەوشى ئاگرينى لە پێيە مێشكى لە گەرمى ئەو پێڵاوە ئاگرينەدا دەكوڵێ.

( الصحيحة ٣٥٠٣)

٨٠٤٨- إن أزواج أهل الجنة ليغنين أزواجهن بأحسن أصوات ما سمعها أحد قط إن مما يغنين: " نحن الخيرات الحسان أزواج قوم كرام " ينظرن بقرة أعيان " و إن مما يغنين به: " نحن الخالدات فلا يمتنه نحن الآمنات فلا يخفنه " نحن المقيمات فلا يظعنه.

( طس ) عن ابن عمر .

**٨٠٤٨ – بەڕاستی هاوسەرەکانی خەڵکی بەهەشت بە خۆشترین دەنگ گۆرانی دەڵێن بۆ مێردەکانیان ، کە کەس گوێی لە دەنگی وا نەبووە ، لە گۆرانیەکانیاندا دەڵێن: ئێمە ئافرەتە چاکەکانین ، هاوسەری بەڕێزەکانین بە کلینەی چاویان دەڕوانن ، هەروەها دەڵێن: ئێمەین نەمرەکان و نایمرێنین ، ئێمەین بێ وەیەکان و نایترسێنین، ئێمەین نیشتەجێ کان و دوورناکەوینەوە .**

( الروض النضير ٤٩٦ )

٨٠٤٩- إن أقل ساكني الجنة: النساء.

( حم م ) عن عمران بن حصين .

**٨٠٤٩- بەڕاستی کەمترین دانیشتوانی بەهەشت : ئافرەتانن .**

( الضعيفة ٢٨٠٠ )

٨٠٥٠- إن الحور العين لتغنين في الجنة يقلن: " نحن الحور الحسان خبئنا لأزواج كرام.

( سمويه ) عن أنس .

**٨٠٥٠- بەڕاستی حۆرییەکانی بەهەشت گۆرانی دەڵێن و ،دەڵێن : ئێمە حۆرییە جوانەکانین ،شاردراوینەتەوە بۆ هاوسەری بەڕێز .**

( الروض النضير ٤٩٦ )

٨٠٥١- إن الرجل من أهل الجنة ليعطى قوة مائة رجل في الأكل و الشرب و الشهوة و الجماع حاجة أحدهم عرق يفيض من جلده فإذا بطنه قد ضمر.

( طب ) عن زيد بن أرقم .

**٨٠٥١- بەڕاستی پیاوی بەهەشتی هێزی سەد پیاوی پێ دەدرێت ،لە خواردن و خواردنەوەو ،ئارەزوو ،جووت بوون ، پیسایشیان ئارەقێکە لە پێشیانەوە دەردەچێت و ئیتر ،سکیان دەنیشێتەوە .**

( المشكاة ٥٦٣٦ )

٨٠٥٢- إن الله تعالى يقول لأهل الجنة: يا أهل الجنة فيقولون: لبيك ربنا و سعديك ! و الخير في يديك فيقول: هل رضيتم ؟ فيقولون: و ما لنا لا نرضى و قد أعطيتنا ما لم تعط أحدا من خلقك فيقول: ألا أعطيكم أفضل من ذلك ؟ فيقولون: يا رب و أي شيء أفضل من ذلك ؟ فيقول: أحل عليكم رضواني فلا أسخط عليكم بعده أبدا.

( حم ق ت ) عن أبي سعيد .

**٨٠٥٢- خواى گەورە بە خەڵكى بەهەشت دەڵێت : ئەى خەڵكى بەهەشت ، ئەوانيش دەڵێن: فەمانت بەجێيە ئەى پەروەردگارمان بە خۆشحاڵى يەوە ، چاكەيش لە دەستى خۆت دايە، ئينجا دەفەرموێت : ئايا ڕازى بوون ؟ ئەوانيش دەڵێن : ئەى بۆچى ڕازى نابين و ، ئەوەندەت پێمان بەخشيوە كە بە هيچ دروستكراوێكت نەبەخشيوە ،دەفەرموێت : ئايا لەوە چاكترتان پێ ببەخشم ، ئەوانيش دەڵێن : ئەى پەروەردگارمان چى شتێك لەوە چاكترە ؟ دەفەرموێت : ڕەزامەندى خۆمتان بەسەردا دەڕێژم و ،ئيتر هەرگيزلێتان تووڕەنابم .**

( المشكاة ٥٦٢٦ )

٨٠٥٣- إن أول زمرة يدخلون الجنة على صورة القمر ليلة البدر ثم الذين يلونهم على أشد كوكب دري في السماء إضاءة لا يبولون و لا يتغوطون و لا يتفلون و لا يتمخطون أمشاطهم الذهب و رشحهم المسك و مجامرهم الألوة و أزواجهم الحور العين أخلاقهم على خلق رجل واحد على صورة أبيهم آدم ستون ذراعا في السماء.

( حم ق ه ) عن أبي هريرة .

**٨٠٥٣ـ بەڕاستى يەكەم دەستە دەچنە بەهەشتەوە وەكو مانگى چواردەن،ئينجا ئەوانەى دواى ئەوان وەكو پرشنگدار ترين هەسارەن لە ئاسماندا، ميزو پيساى ناكەن و تف و چڵميان نيە، شانەكانيان لە ئاڵتونەو، ئارەقيان گوڵاوەو، جێگاى بوخورديان بۆنى خۆشەو،هاوسەرەكانيان حۆرى جوانەو ، ڕەوشتيان وەكو ڕەوشتى يەك پياوە لەسەر شێوەى ئادەمى باوكيانن ، شەست باڵە بەرەو ئاسمان .**

( الصحيحة ٣٥١٩)

٨٠٥٤- إن أهل الجنة إذا جامعوا نساءهم عادوا أبكارا.

( طس ) عن أبي سعيد .

**٨٠٥٤ـ بەڕاستی خەڵکی بەهەشت کاتێك لەگەڵ خێزانەکانیان جووت دەبن، جارێکی تر وەکو کچی عازەبیان لێ دێتەوە.**

( الصحيحة ٣٣٥١)

٨٠٥٥- إن أهل الجنة ليتراءون أهل الغرف في الجنة كما تراءون الكواكب في السماء.

( حم ق ) عن سهل بن سعد .

**٨٠٥٥ـ بێگومان خەڵکی بەهەشت خەڵکی ژوورەکانی بەهەشت دەبینن وەکو چۆن هەسارەکان لە ئاسمان دەبینن .**

( الروض النضير ٣٦١ )

٨٠٥٦- إن أهل الجنة ليتراءون أهل الغرف من فوقهم كما تراءون الكوكب الدري الغابر في الأفق من المشرق أو المغرب لتفاضل ما بينهم.

( حم ق ) عن أبي سعيد ( ت ) عن أبي هريرة

**٨٠٥٦ـ بەڕاستی خەڵکی بەهەشت خەڵی ژوورەکانی سەرەوەیان دەبینن هەر وەکو هەسارەی پرشنگدار لە ئاسۆدا دەبینن ،لە ڕۆژهەڵات ،یان لە ڕۆژئاوا لەبەر پلەو پایەی نێوانیان .**

( الروض النضير٣٦١ )

٨٠٥٧- إن أهل الجنة يأكلون فيها و يشربون و لا يتفلون و لا يبولون و لا يتغوطون و لا يتمخطون و لكن طعامهم ذلك جشاء و رشح كرشح المسك يلهمون التسبيح و التحميد كما تلهمون أنتم النفس.

( حم م د ) عن جابر .

**٨٠٥٧ـ بەڕاستی خەڵکی بەهەشت لەبەشتا دەخۆن و ، دەخۆنەوە ، تف ناکەن و میزو پیسای ناکەن و ،چڵمیان نیە و ، بەڵام لە خواردنەکەیان قرقێنەیان[1] هەیەو ،ئارەقیان وەکو گوڵاوە ،(سبحان الله )و (الحمدلله ) یان دەخرێتە سەر زمان وەکو چۆن ئێوە هەناسە دەدەن .**

( الصحيحة ٣٥٢٠ )

---

**[1] واتە : بە قرقێنەیە خواردن و خواردنەوەکەیان لە لاشەیان دەبورێت و زیادەکەی لەشێوەو بۆنی میسك دێتە دەرەوە.**

٨٠٥٨- إن رجلا من أهل الجنة استأذن ربه في الزرع فقال له: ألست فيما شئت ؟ قال: بلى و لكن أحب أن أزرع ! فبذر فبادر الطرف نباته و استواؤه و استحصاده فكان أمثال الجبال فيقول الله: دونك يا ابن آدم ! فإنه لا يشبعك شيء.

(صحيح) (حم م د) عن جابر.

**٨٠٥٨ ـ پیاوێك لە خەڵكی بەهەشت داوای مۆڵەتی كرد لە پەروەردگاری خۆی كە كشت و كاڵ بكات ، خوای گەورە پێی فەرموو : ئایا ئەوەی دەتەوێت لەبەر دەستدا نیە ؟وتی: بەڵێ ، بەڵام حەزم لە كشت و كاڵە ، ئیتر تۆوێی چاندو ، هەتا چاو بڕ بكات كشت و كاڵەكەی بەرز دەبێتەوە ،وەكو چیاكان ، جا خوای گەورە دەفەرموێت :ئەوە ئەوەیە كە داوات كرد ئەی ئادەمیزاد !بەڕاستی هیچ تێرت ناكات .**

( المشكاة ٥٦٥٠ )

٨٠٥٩- إن في الجنة بحر الماء و بحر العسل و بحر اللبن و بحر الخمر ثم تشقق الأنهار بعد.

( حم ت ) عن معاوية بن حيدة .

**٨٠٥٩ـ بەڕاستی لە بەهەشتدا دەریای ئاو و دەریای هەنگوین و ،دەریای شیرو ،دەریای مەی هەیە ، ئینجا ڕوبارەكان لە دوای ئەوە لەت لەت دەكرێن.**

( المشكاة ٥٦٥٠ )

٨٠٦٠- إن في الجنة غرفا يرى ظاهرها من باطنها و باطنها من ظاهرها أعدها الله تعالى لمن أطعم الطعام و ألان الكلام و تابع الصيام و صلى بالليل و الناس نيام.

( حم حب هب ) عن أبي مالك الأشعري ( ت ) عن علي .

**٨٠٦٠ـ بەڕاستی لەبەهەشتدا هەندێك ژوور هەیە دەرەوەی لە ناوەوە دەبینرێت، ناوەوەی لە دەرەوە دەبینرێت ، خوای گەورە ئامادەی كردووە بۆ كەسێك خواردن ببەخشێت و، قسەی خۆشبێت و، بە دوای یەكدا ڕۆژوو بگرێت و ، بە شەو نوێژ بكات كاتێك خەڵكی لە گەرمەی خەودان .**

( المشكاة ١٢٣٥ )

٨٠٦١- إن في الجنة لسوقا يأتونها كل جمعة فيها كثبان المسك فتهب ريح الشمال فتحثوا في وجوههم و ثيابهم فيزدادون حسنا و جمالا فيرجعون إلى أهليهم و قد ازدادوا حسنا و جمالا فيقول لهم أهلوهم: و الله لقد ازددتم بعدنا حسنا و جمالا فيقولون: و أنتم و الله لقد ازددتم بعدنا حسنا و جمالا.

( حم م ) عن أنس .

**٨٠٦١- بەڕاستی لە بەهەشتدا بازاڕێك هەیە هەموو هەینیەك سەردانی دەكەن ، تەپۆلك ەیەكی میسكی تیایە ،بای شەماڵ هەڵدەكات لەو میسكە دەكات بە ڕوومەت و پۆشاكەكانیاندا ،ئەوەندەی تر جوانیان دەكات ،ئیتر دەگەڕێنەوە لای كەس و كارەكانیان و ،ئەوانیش دەڵێن : بەخوا لە دوای ئێمە زۆرجوانتر بوون ،ئەوانیش دەڵێن سوێند بەخوا ئێوەش لە دوای ئێمە زۆر جوانتر بوون .**

( الصحيحة ٣٤٧١ )

٨٠٦٢- إن في الجنة لشجرة يسير الراكب الجواد المضمر السريع في ظلها مائة عام ما يقطعها.

( حم خ م ت ) عن أنس ( ق ) عن سهل بن سعد ( حم ق ت ) عن أبي سعيد ( ق ت ه ) عن أبي هريرة .

٨٠٦٣- إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله ما بين الدرجتين كما بين السماء و الأرض فإذا سألتم الله فسلوه الفردوس فإنه أوسط الجنة و أعلى الجنة و فوقه عرش الرحمن و منه تفجر أنهار الجنة.

( حم خ ) عن أبي هريرة .

**٨٠٦٢- بەڕاستی لە بەهەشتدا درەختێك هەیە سوارچاكی تیژڕەو سەد ساڵ لە سێبەرەكەیدا بە غار دەڕوات و تەواو نابێت .**

( الصحيحة ١٩٨٥ )

**٨٠٦٣- لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە ،خوای گەورە ئامادەی كردووە بۆ خەباتكارانی ڕێگای خوا ، نێوان هەر دوو پلەیەكیان وەكو نێوانی ئاسمان و زەویە ،بۆیە ئەگەر داوای بەهەشتتان كرد داوای فیردەوس بكەن ، چونكە ناوەڕاست و سەرەوەی بەهەشتەو ،عەرشی خوایش لە سەریەوەیەتی ،هەر لە وێشەوە ڕووبارەكانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن .**

( الصحيحة ٩١٨ )

٨٠٦٤- إن في الجنة ما لا عين رأت و لا أذن سمعت و لا خطر على قلب أحد.

( طب ) عن سهل بن سعد .

**٨٠٦٤- بەڕاستی ئەوەی لە بەهەشتدا هەیە نە چاو بینیو یەتی و ،نە گوێ بیستوویەتی و ،نە بە دڵی كەسیشدا هاتووە.**

( الصحيحة ١٠٨٦ )

٨٠٦٥- إن للمؤمن في الجنة لخيمة من لؤلؤة واحدة مجوفة طولها ستون ميلا للمؤمن فيها أهلون يطوف عليهم المؤمن فلا يرى بعضهم بعضا.

( م ) عن أبي موسى .

**٨٠٦٥- بەڕاستی بڕوادار لە بەهەشتدا خێوەتێكی هەیە لە یەك دانە مرواری هەڵۆڵ و پێچراوە ،درێژاییەكەی شەست میلە ،بڕوادار لەوێدا چەندەها هاوسەری هەیە بەسەریاندا دەسوڕێتەوە و ،كەسیان كەسیان نابینن .**

( الصحيحة ٣٥٤١ )

٨٠٦٦- إن ما بين مصراعين في الجنة لمسيرة أربعين سنة.

( حم ع ) عن أبي سعيد .

**٨٠٦٦- بەڕاستی نێوان دوو لاشیپانی هەر دەرگایەكی لە بەهەشتدا ، ساڵە ڕێیەكە.**

( الصحيحة ١٦٩٨ )

٨٠٦٧- إنه لا يدخل الجنة ألا نفس مسلمة و أيام منى أيام أكل و شرب.

( حم ن ه ) عن بشير بن سحيم .

**٨٠٦٧- بێگومان هیچ كەس ناچێتە بەهەشتەوە موسڵمان نەبێت ،ڕۆژانی ( منى )یش ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەی .**

( ألارواء ٩٤٥ )

٨٠٦٨- إني لأعلم آخر أهل النار خروجا منها و آخر أهل الجنة دخولا الجنة رجل يخرج من النار حبوا فيقول الله له: اذهب فادخل الجنة فيأتيها فيخيل إليه أنها ملأى فيرجع فيقول: يا رب وجدتها ملأى ! فيقول الله له: أذهب فأدخل الجنة فإن لك مثل الدنيا و عشرة أمثالها فيقول: أتسخر بي و أنت الملك ؟.

( حم ق ت ه ) عن ابن مسعود .

**٨٠٦٨- بەڕاستی من دەزانم كێ دواترین كەس لە دۆزەخ دێتەدەر و ،دواترین كەسیش كە دەچێتە بەهەشتەوە ، پیاوێكە بە گاگۆڵكێ لە دۆزەخ دێتەدەر ،خوای گەورە پێی دەفەرموێت : بڕۆ بۆ بەهەشت ، كاتێك دەڕوات وادەزانێت پڕ بووە ،دەگەڕێتەوە ،دەڵێت : پەروەردگار بینیم پڕ بووە!خوای گەورە پێی دەفەرموێت : بڕۆ بۆ نێو بەهەشت ،دە ئەوەندەی دونیام پێ بەخشیویت لە بەهەشتتا ،ئەویش دەڵێت : گاڵتەم پێ دەكەیت و ،تۆ پادشای ؟**

( المشكاة ٥٥٨٦ )

٨٠٦٩- أهل الجنة: جرد مرد كحل لا يفنى شبابهم و لا تبلى ثيابهم.
( ت ) عن أبي هريرة .

**٨٠٦٩- خەڵكى بەهەشت لاشەو دەم و چاويان بێ تووكە ، چاو ڕێژكراون تەمەنى لاوييان بەسەر ناچێت و ،جل و بەرگيان شڕ نابێت .**

( المشكاة ٥٦٣٨ )

٨٠٧٠- أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر و الثانية على لون أحسن من كوكب دري في السماء لكل رجل منهم زوجتان على كل زوجة سبعون حلة يبدو مخ ساقها من ورائها.
( حم ت ) عن أبي سعيد .

**٨٠٧٠- يەكەم دەستە دەچنە بەهەشتەوە وەكو مانگى چواردەن ، ،دووەميان وەكو جوانترين هەسارەى پرشنگ دارن لە ئاسمان ،هەريەكەو دوو هاوسەريان هەيە ،هەر هاوسەرێكيان حەفتا [1] پۆشاكى جوانى هەيە ،مۆخى لاقيان لەدەرەوە ديارە .**

( الصحيحة ١٧٣٦ )

٨٠٧١- أول زمرة تدخل الجنة على صورة القمر ليلة البدر و الذين على أثرهم كأشد كوكب دري في السماء إضاءة قلوبهم على قلب رجل واحد لا اختلاف بينهم و لا تباغض و لا تحاسد لكل امرئ منهم زوجتان كل واحدة منهما يرى مخ سوقها من وراء لحمها من الحسن يسبحون الله بكرة و عشيا لا يسقمون و لا يمتخطون و لا يبصقون آنيتهم الذهب و الفضة و أمشاطهم الذهب و وقود مجامرهم الألوة.
( ق ) عن أبي هريرة .

**٨٠٧١- يەكەم كۆمەڵە دەچنە بەهەشتەوە لەوێنەى مانگى چواردەن ، ،ئەوانەى بەدواى ئەواندا دێن وەكو ڕووناكترين هەسارەى درەوشاوەن ،دڵيان وەكو دڵى يەك كەس ،ناكۆكى نييە لە نێوانيانندا ،ڕقيان لە يەكتر نييە و ،ئێرەيى بەيەكتر نابەن ،هەموو كەسێكيان دوو هاوسەرى هەيە ،مۆخى ئێسكى لاقيان لە دەرەوەى گۆشتەكەيەوە دەبينرێت لە جوانيدا ،خواى خۆيان بێگەرد ڕادەگرن ،لە بايەنيان و ئێوارانداا ،نەخۆش ناكەون و چڵم و تفييان نييە ،قاپەكەنيان لە ئاڵتوون و زيوە ،شانەكانيان لە ئاڵتوونە سووتەمەنى جێگاى بوخوردەكانيان دارى بۆن خۆشە .**

( المشكاة ٥٦١٩ )

---

[1] لە زمانى عەرەبيدا وشەى ( سبعين ) واتە : حەفتا ،مەبەست لە خودى ژمارەكە نييە ؟ بەڵكو ئاكارژەيە بۆ زۆرى ،بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆرە لە قورئان و فەرموودەكاندا . ( وەرگێڕ )

٨٠٧٢- أول زمرة تلج الجنة صورتهم على صورة القمر ليلة البدر لا يبصقون فيها و لا يمتخطون و لا يتغوطون آنيتهم فيها الذهب و أمشاطهم من الذهب و الفضة و مجامرهم الألوة و رشحهم المسك و لكل واحد منهم زوجتان يرى مخ سوقها من وراء اللحم من الحسن لا اختلاف بينهم و لا تباغض قلوبهم قلب واحد يسبحون الله بكرة و عشيا.

( حم ق ت ) عن أبي هريرة .

**٨٠٧٢- یەکەم دەستە دەچنە بەهەشتەوە شێوەیان وەکو شێوەی مانگی چواردەن ،،تف ناکەن و ،چڵمیان نییە و ، پیسایی ناکەن ،قاپەکانیان لە ئاڵتوونەو ،شانەکانیشیان لە ئاڵتوون و زیوە ،بوخووردانەکانیان[1] داری بۆن خۆشیان تیا دەسووتێ ،ئارەقیان میسك و گوڵاوە ،هەمو پیاوێك دوو هاوسەری هەیە ،مۆخی ئێسکی لاقیان لەسەر گۆشتەکەیانەوە دەبینرێت ئەوەندە جوانە ،جیاوازی و کینە لە ناویاندا نییە ، دڵەکانیان وەکو دڵی یەك کەسە بەیانیان و ئێوارە( سبحان الله ) دەکەن .**

( المشكاة ٥٦١٩ )

٨٠٧٣- أول شيء يأكله أهل الجنة زيادة كبد الحوت.

( الطيالسي ) عن أنس .

**٨٠٧٣- یەکەمین شت خەڵکی بەهەشت دەیخۆن زیادەی جگەری حووتە .**

(الصحيحة ٣٣٠٦ )

٨٠٧٤- أولاد المشركين خدم أهل الجنة.

( طس ) عن سمرة وعن أنس .

**٨٠٧٤- منداڵی بت پەرستەکان خزمەتکاری خەڵکی بەهەشتن .**

( الصحيحة ١٤٨٦ )

٨٠٧٥- ألا أخبركم برجالكم من أهل الجنة ؟ النبي في الجنة و الشهيد في الجنة و الصديق في الجنة و المولود في الجنة و الرجل يزور أخاه في ناحية المصر في الله في الجنة " ألا أخبركم بنسائكم من أهل الجنة ؟ الودود الولود العئود التي إذا ظلمت قالت: هذه يدي في يدك لا أذوق غمضا حتى ترضى.

( الدارقطني في الأفراد طب ) عن كعب بن عجرة .

---

[1] **یان گوڵاو پرژێنەکانیان (( گوڵاو ڕێژ ))ەکانیان .**

**٨٠٧٥- ئايا باسی پياوانی ئێوە بكەم كە بەهەشتين : پێغەمبەر لە بەهەشتدايە و ، شەهيد لە بەهەشتدايەو ،ڕاستگۆ لە بەهەشتدايەو ، پياوێك سەردانی براكەی بكات لە پەڕی شارێك لە بەهەشتدايە و ،ئايا باسی ئەو ئافرەتانەتان بۆ بكەم كە دەچنە بەهەشتەوە ؟ ميهرەبان و خۆشەويست و بە سك و زا ئەوەی هەر سوودی هاوسەرەكەی دەوێت[1] ئەگەر ستەميشی لێبكرێت دەڵێت: ئەوە دەستم لە دەستدايە ،چاوم سەريەك نانێم تاكو ڕازی نەبێت .**

( الروض النضير ٤٦ )

٨٠٧٦- ألا أنبئك بأهل الجنة ؟ الضعفاء المغلوبون.

( طب ) عن ابن عمرو .

**٨٠٧٦- ئايا هەواڵی خەڵكی بەهەشتت پێبدەم ؟ لاوازو ستەم لێكراوەكانن .**

( الصحيحة ٩٢٨ )

٨٠٧٧- بينا أنا أسير في الجنة إذ عرض لي نهر حافتاه قباب اللؤلؤ الجوف قلت: يا جبريل ما هذا ؟ قال: هذا الكوثر الذي أعطاكه الله ثم ضرب بيده إلى طينه فاستخرج مسكا ثم رفعت لي سدرة المنتهى فرأيت عندها نورا عظيما.

( خ ت ) عن أنس .

**٨٠٧٧- لە كاتێكدا لە بەهەشتدا دەڕۆيشتم ڕووبارێكم پيشان درا قەراغەكانی لە مرواری كلۆر بوو ،وتم : ئەی جبريل ئەوە چی يە ؟ فەرمووی : ئەوە كەوسەرە كە خوای گەورە پێی بەخشيوی ،ئينجا دەستی بۆ برد بۆ قوڕەكەی و هەندێ ميسك و گوڵاوی دەرهێنا ،ئينجا** ( سدرة المنتهى )**م پيشاندرا ئيتر ڕووناكيەكی گەورەم لەوێدا بينی .**

( صحيح الترمذي ٣٣٦٠ )

٨٠٧٨- تحاجت النار و الجنة فقالت النار: أوثرت بالمتكبرين و المتجبرين و قالت الجنة: فما لي لا يدخلني إلا ضعفاء الناس و سقطهم و عجزهم ؟ فقال الله عز و جل للجنة: إنما أنت رحمتي أرحم بك من أشاء من عبادي و قال للنار: إنما أنت عذابي أعذب بك من أشاء من عبادي و لكل واحدة منكما ملؤها فأما النار فلا تمتلئ حتى يضع الله قدمه عليها فتقول: قط قط فهنالك تمتلئ و ينزوي بعضها إلى بعض فلا يظلم الله من خلقه أحدا و أما الجنة فإن الله ينشئ لها خلقا

( حم ق ) عن أبي هريرة .

---

[1] **العؤود : التي تعود على زوجها بالنفع . التيسر بشرح جامع الصغير ص١٩٢ .**

**٨٠٧٨- دۆزەخ و بەهەشت گفتوگۆیان کرد و ،دۆزەخ وتی : هەرچی خۆ بەگەورە زان و سەرکەش هەیە لەنێومدان ،بەهەشتیش وتی: کەسی لاوازو ،بایەخ پێنەدراوو، پەککەوتوو نەبێت نایەتە نێومەوە ،خوای گەورە بە بەهەشتی فەرموو : تۆ میهرەبانی منی ،بە تۆ بەزەییم دێتەوە بە هەرکەسێکدا بمەوێت لە بەندەکانم ،بە دۆزەخیشی فەرموو : تۆ ئەشکەنجەی منی ،سزای هەرکەسێکت پێ دەدەم بمەوێت لە بەندەکانم ، هەرکام لە ئێوەش پڕ دەبن ،بەلاّم دۆزەخ پڕ نابێتەوە تا خوای گەورە پێ نەخاتە ناوی و ،ئەویش دەڵێت : هەرگیز و هەرگیز ،ئەو کاتە پڕ دەبێت ودێتەوە یەك ،،خوای گەورەیش ستەم لە هیچ کەس ناکات لە دروستکراوەکانی ،بەلاّم بۆ بەهەشت خوای گەورە دروستکراوانێك درووست دەکات .**

( المشكاة ٥٦٩٤ )

٨٠٧٩- تحشرون حفاة عراة غرلا.

( خ ) عن عائشة ( ت ك ) عن ابن عباس .

**٨٠٧٩- ئێوە حەشر دەکرێن بە پێی پەتی و بە ڕووت و قوتی و خەتەنە نەکراوی .٠**

( صحيح الترمذي ٣٣٣٢ )

٨٠٨٠- جنة الفردوس هي ربوة الجنة العليا التي هي أوسطها و أحسنها.

( طب ) عن عمرة.

**٨٠٨٠- بەهەشتی فیردەوس و تە پۆڵکەی بەرزی بەهەشت ، ئەو ناوەڕاست و چاکترین جێگایەتی .**

( الصحيحة ٢٠٠٣ )

٨٠٨١- جنتان من فضة آنيتهما و ما فيهما و جنتان من ذهب آنيتهما و ما فيهما و ما بين القوم و بين أن ينظروا إلى ربهم إلا رداء الكبرياء على وجهه في جنة عدن.

( ق ت ن ه ) عن أبي موسى .

**٨٠٨١- دوو بەهەشت لە زیون قاپەکانیان و هەرچییان تێدایە ،دوو بەهەشتیش لە ئاڵتوونن ،قاپەکانیان و هەرچییان تیا هەیە ،لە نێوان ئەواندا و ئەوەی بڕواننە پەروەردگاریان تەنها پۆشاکی مەزنی لەسەر ڕووخساری هەیە لە بەهەشتی عەدندا .**

( الضعيفة ٣٤٦٥ )

٨٠٨٢- الجنة أقرب إلى أحدكم من شراك نعله و النار مثل ذلك.

( حم خ ) عن ابن مسعود .

**٨٠٨٢- بەهەشت هەر یەکێکتان نزیکترە لە بنی کەوشەکەی ،دۆزەخیش بەهەمان شێوە .**

( الصحيحة ٣٦٢٤ )

٨٠٨٣- الجنة بناؤها لبنة من فضة و لبنة من ذهب و ملاطها المسك الأذفر و حصباؤها اللؤلؤ و الياقوت و تربتها الزعفران من يدخلها ينعم لا يبأس و يخلد لا يموت لا تبلى ثيابهم و لا يفنى شبابهم.

( حم ت ) عن أبي هريرة .

**٨٠٨٣- بەهەشت دروستکردنەکەی خشتێکی لە زیوەو ،خشتێکی لە ئاڵتوونەو ،ڕووکەشی دیوارەکەی لە ڕووەکی بۆن خۆشە و ،بەردەکانی لە مرواری و گەوهەری درەوشاوەیە و، خۆڵەکەی لە زافەرانە ،هەرکەس بچێتە ناوی بەهرەمەند دەبێت و ،هەرگیز خەمبار نابێت و ،بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوەو ،نامرێت و ،جلەکانیان شڕ نابێت و ،سەردەمی لاوییان بەسەر ناچێت .**

( المشكاة ٦٥٣٠ )

٨٠٨٤- الجنة لبنة من ذهب و لبنة من فضة.

( طس ) عن أبي هريرة .

**٨٠٨٤- بەهەشت خشتێکی لە ئاڵتوونەو خشتێکی لە زیوە .**

( المشكاة ٥٦٣٠ )

٨٠٨٥- الجنة لها ثمانية أبواب و النار لها سبعة أبواب.

( ابن سعد ) عن عتبة بن عبد .

**٨٠٨٥- بەهەشت هەشت دەرگای هەیە و ،دۆزەخیش حەوت دەرگای هەیە .**

( الصحيحة ١٨١٢ )

٨٠٨٦- الجنة مائة درجة ما بين كل درجتين كما بين السماء و الأرض.

( ابن مردويه ) عن أبي هريرة .

**٨٠٨٦- بەهەشت سەد پلەیە ، نێوان هەر دوو پلەیەك ئەوەندەی نێون ئاسمان و زەویە .**

( الصحيحة ٩١٨ )

٨٠٨٧- الجنة مائة درجة ما بين كل درجتين كما بين السماء و الأرض و الفردوس أعلى الجنة و أوسطها و فوقه عرش الرحمن و منها يتفجر أنهار الجنة فإذا سألتم الله فاسألوه الفردوس.

( ه ) عن معاذ ( ك ) عن عبادة بن الصامت وأبي هريرة ( ابن عساكر ) عن أبي عبيدة بن الجراح .

٨٠٨٧- بەهەشت سەد پلەیە نێوان هەر دوو پلەکیان وەکو نێوان ئاسمان و زەوییە ، فیردەوسیش سەرەوەی بەهەشتە و ناوەڕاستێتی عەرشی خوایش لە سەریەوەیەتی ، لەوێشەوە ڕووبارەکانی بەهەشت سەرچاوە دەگرن ،جا ئەگەر لە خوا پاڕانەوە داوای فیردەوسی لێ بکەن .

( الصحيحة ٩٢٢ )

٨٠٨٨- حفت الجنة بالمكاره و حفت النار بالشهوات.

( حم م ت ) عن أنس ( م ) عن أبي هريرة ( حم في الزهد ) عن ابن مسعود موقوفا .

٨٠٨٨- بەهەشت بە ناڕەحەتی[1] پەرژین کراوە و ،ئاگریش بە ئارەزووەکان پەرژین کراوە.

( صحيح الترمذي ٢٥٥٩ )

٨٠٨٩- الخيمة درة مجوفة طولها في السماء ستون ميلا في كل زاوية منها للمؤمن أهل لا يراهم الآخرون.

( ق ) عن أبي موسى .

٨٠٨٩- خێوەت لە بەهشتدا گوهەرێکی بۆشە درێژاییەکەی بەرەو لە ئاسماندا شەست میلە ،لە هەمووگۆشەیەکدا کەس و کاری (( هاوسەری )) تیایە بۆ بڕوادار ، کە کەسانی تر نایان بینن .

( صحيحة الترمذى ٢٥٢٧ )

٨٠٩٠- دخلت الجنة فإذا أنا بنهر حافتاه خيام اللؤلؤ فضربت بيدي إلى ما يجري فيه الماء فإذا مسك أذفر فقلت: ما هذا يا جبريل ؟ قال: هذا الكوثر الذي أعطاكه الله.

( حم خ ت ن ) عن أنس .

٨٠٩٠- چوومە بەهەشتەوە لەوێ ڕووبارێکم بینی قەراغەکانی لە مرواریییە ،دەستم لە ئاوەکەی وەردا بینیم گوڵاوی ( إذفر )ە وتم : ئەوە چی یە ؟ ئەی جبریل ؟ وتی ئەو (كوثر )ەیە کە خوای گەورە پێی بەخشیوی .

( الاسرا وا المعراج ٣٩ )

٨٠٩١- ذراري المسلمين يكفلهم إبراهيم .

( أبو بكر بن أبي داود في البعث ) عن أبي هريرة.

---

[1] ئەو شتانەی مرۆڤ پێی ناخۆشەو ئەنجامدانی قورسە لەسەری وەکو خواپەرستنەکان و ئارام گرتن لەسەر کارەساتی ناخۆش .

**٨٠٩١- مناڵە نەباڵقەكانى موسڵمانان لە ئەستۆى ئيبراهيم دان .**

( الصحيحة ٦٠٥ )

٨٠٩٢- ذر الناس يعملون فإن الجنة مائة درجة ما بين كل درجتين كما بين السماء و الأرض و الفردوس أعلاها درجة و أوسطها و فوقها عرش الرحمن و منها تفجر أنهار الجنة فإذا سألتم الله فاسألوه الفردوس .

( حم ت ) عن معاذ.

**٨٠٩٢- لە خەڵكى گەڕێ كار بكەن ، چونكە بەهەشت سەد پلەيە ،نێوان هەر دوو پلەيەك وەكو نێوان ئاسمان و زەوى يە ، فيردەوسيش بەرزترين شوێنەو ناوەڕاستى بەهەشتە ، عەرشى پەروەردگاريش لە سەرمووەيەتى و لە وێشەوە ڕوبارەكانى بەهەشت سەرچاوە دەگرن ، بۆيە ئەگەر لە خوا پاڕانەوە داواى فيردەوس بكەن .**

( الصحيحة ٩١٩ )

٨٠٩٣- سأل موسى ربه فقال: يا رب ما أدنى أهل الجنة منزلة ؟ قال: هو رجل يجيء بعدما يدخل أهل الجنة الجنة فيقال له: ادخل الجنة فيقول: أي رب كيف و قد نزل الناس منازلهم و أخذوا أخذاتهم ؟ فيقال له: أترضى أن يكون لك مثل ملك ملك من ملوك الدنيا ؟ فيقول: رضيت رب فيقول: لك و مثله و مثله و مثله و مثله فقال في الخامسة: رضيت رب فيقول هذا لك و عشرة أمثاله و لك ما اشتهت نفسك و لذت عينك فيقول رضيت رب ! قال: رب فأعلاهم منزلة قال أولئك الذين أردت غرست كرامتهم بيدي و ختمت عليها فلم تر عين و لم تسمع أذن و لم يخطر على قلب بشر.

( حم م ت ) عن المغيرة بن شعبة.

**٨٠٩٣- موسا داواى لە پەروەردگارى كردو فەرمووى: ئەى پەروەردگارم نزمترين پلەو پايەى خەڵكى بەهەشت چۆنە؟ فەرمووى: پياوێك دێت پاش ئەوەى ئەهلى بەهەشت چونەتە بەهەشتەوە ، پێى دەوترێت :برۆ بەهەشتەوە ، دەڵێت: دواى ئەوەى كە خەڵكى جێگاى خۆيانيان گرت و ،بەخششى خۆيانيان وەرگرت ؟پێى دەوترێت :ئايا رازى دەبيت ئەوەندەى موڵكى پادشايەك لە پادشاكانى دونيات هەبێت؟ دەڵێت :ڕازيم خوايە، خواى گەورە پێى دەفەرموێت: ئەوە بۆ تۆيە لەگەڵ ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەى تر، لە پێنجەم جاردا وتى : خوايە ڕازيم ، دەفەرموێت : ئەوەندە بۆ تۆو دەئەوەندەى**

**تریش و، هەرچیش حەزی لیٚ بكەیت و ئارەزوت لیٚ بیت پیٚت دەبەخشم .دەڵیٚت: ڕازیم خوایە ! ئینجا موسى دەفەرمویٚت : پەروەردگارم ئەی بەرزترین پلەو پایە ؟ فەرمووی : ئەوانەن كە هەڵمبژاردوون دەستی خۆم ڕیٚزم بۆ چاندن و مۆرم كردووە ، نە چاو بینیویەتی و نە گویٚ بیستوویەتی و ، نە بە ئەندیٚشەی هیچ كەسیٚكدا هاتووە .**

( الترغيب ٣٧٠٢ )

٨٠٩٤- سددوا و قاربوا و أبشروا و اعلموا أنه لن يدخل أحدكم الجنة عمله و لا أنا إلا أن يتغمدني الله بمغفرة و رحمة.

( حم ق ) عن عائشة.

**٨٠٩٤- ڕاستی بپیٚكن و لیٚك نزیك ببنەوە و مژدەدەربن ، ئەوەش بزانن هەرگیز كەس بە كردەوەی خۆی ناچیٚتە بەهەشتەوە ،تەنانەت منیش ،مەگەر خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی داميپۆشیٚت .**

( الترغيب ٣٥٩٨ )

٨٠٩٥- لن ينجي أحدا منكم عمله و لا أنا إلا أن يتغمدني الله برحمته و لكن سددوا و قاربوا و اغدوا و روحوا و شيء من الدلجة و القصد القصد تبلغوا.

( ق ) عن أبي هريرة.

**٨٠٩٥- هەرگیز هیچ كەسیٚك لە ئیٚوە بە كردەوەی ڕزگاری نابیٚت ، تەنانەت منیش مەگەر خوای گەورە بە بەزەیی خۆی داميپۆشیٚ، بەلاٌم ڕاست و دروست بن و ، لیٚك نزیكببنەوە بەیانی و ئیٚوارەو ، هەندیٚك لە شەو ،لە سەرخۆیی لەسەرخۆیی بەڵكو بگەنەجیٚ .**

( المشكاة ٢٣٧١ )

٨٠٩٦- سلوا الله لي الوسيلة أعلى درجة في الجنة لا ينالها إلا رجل واحد و أرجو أن أكون أنا هو.

( ت ) عن أبي هريرة.

**٨٠٩٦- داوای ( وسيلة )م بۆ بكەن لە خوای گەورە ، كە بەرزترین پلەیە لە بەهەش و دەست كەس ناكەویٚت تەنها پیاویٚك نەبیٚت ،ئومیٚدەوارم ئەویش خۆم بم .**

( المشكاة ٥٧٦٧ )

٨٠٩٧- سلوا الله لي الوسيلة فإنه لا يسألها لي عبد في الدنيا إلا كنت له شهيدا أو شفيعا يوم القيامة.

( ش طس ) عن ابن عباس.

**٨٠٩٧- لە داوا خوا بكەن وەسيلەم پێ ببەخشێت ،چونكە هەر كەسێك داواى ئەوەم بۆ بكات بۆى دەبمە شايەت و تكاكار لە رۆژى قيامەتدا .**

( فضل الصلاة ٤٨ )

٨٠٩٨- سيحان و جيحان و الفرات و النيل كل من أنهار الجنة.

( م ) عن أبي هريرة.

**٨٠٩٨- سيحان و جيحان وفورات و نيل هەموويان لە رووبارەكانى بەهەشتن.**

( الصحيحة ١١٠ )

٨٠٩٩- سيد ريحان أهل الجنة الحناء.

( طب خط ) عن ابن عمرو.

**٨٠٩٩- چاكترين رێحانەى خەڵكى بەهەشت خەنەيە .**

( الصحيحة ١٤٢٠ )

٨١٠٠- السيوف مفاتيح الجنة.

( أبو بكر في الغيلانيات ابن عساكر ) عن يزيد بن شجرة.

**٨١٠٠- شمشێرەكان[1] كليلى بەهەشتن .**

( الصحيحة ٢٦٧٢ )

٨١٠١- ضحكت من قوم يساقون إلى الجنة مقرنين في السلاسل .

( حم ) عن أبي أمامة.

**٨١٠١- پێكەنيم بە كەسانێك بەرەو بەهەشت دەبرێن و لە كۆت و زنجيردان [2].**

( السنة ٥٧٣ )

٨١٠٢- طوبى شجرة في الجنة مسيرة مائة عام ثياب أهل الجنة تخرج من أكمامها

( حم حب ) عن أبي سعيد

**٨١٠٢- ( طوبى ) درەختێكى لە بەهەشتدا سەد ساڵە رێيە ، پۆشاكى خەڵكى بەهەشت لە قۆزاخەو خونچەى گوڵەكانى دەردەهێنرێت .**

( الصحيحة ١٩٨٥ )

---

[1] واتە : شمشێرى موجاهيدەكان ( خەباتكێرەكان ).

[2] مەبەست لەو ديلانەن لە كاتى ديليدا موسڵمان دەبن.

٨١٠٣- عجبت لأقوام يساقون إلى الجنة في السلاسل و هم كارهون .

( طب ) عن أبي أمامة ( حل ) عن أبي هريرة.

**٨١٠٣- سەیرم لە کەسانێك دێت بە زۆر بە كۆت و زنجیرەوە بۆ بەهەشت دەبرێت .**

( السنة ٥٧٣ )

٨١٠٤- عرضت علي الجنة و النار آنفا في عرض هذا الحائط فلم أر كاليوم في الخير و الشر و لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلا و لبكيتم كثيرا .

( م ) عن أنس.

**٨١٠٤- هەرزوو بەهەشت و دۆزەخم پیشاندرا لە پانایی ئەو دیوارەدا[1] ، هەرگیز پێشتر دیمەنی خۆش و ناخۆشی ئاوهام نەبینی بوو پێشتر، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیبا ، کەم پێدەکەنین و ، زۆر دەگریان .**

( الترغيب ٣٦٦٣ )

٨١٠٥- فجرت أربعة أنهار من الجنة: الفرات و النيل و سيحان و جيحان.

( حم ) عن أبي هريرة.

**٨١٠٥- چوار ڕووبار لە بەهەشت هەڵقوڵاون : فوڕات و نیل و سیحان و جیحان .**

( الصحيحة ١١١ )

٨١٠٦- في الجنة باب يدعى الريان يدعى له الصائمون فمن كان من الصائمين دخله و من دخله لا يظمأ أبدا.

( ت ه ) عن سهل بن سعد.

**٨١٠٦- لە بەهەشتدا دەرگایەك هەیە ڕەییانی پێ دەوترێت ڕۆژووەوانەکانی بۆ بانگ دەدرێت. جا هەرکەسێك لە ڕۆژووانەکان بێت لە وێوە دەچێتە ژوورەوە ، هەرکەسیش لەوێوە بچێتە ژوورەوە هەرگیز تینووی نابێت .**

( صحيح الترمذي ٧٦٥ )

٨١٠٧- في الجنة خيمة من لؤلؤة مجوفة عرضها ستون ميلا في كل زاوية منها أهل ما يرون الآخرين يطوف عليهم المؤمن.

( حم م ت ) عن أبي موسى.

---

[1] **واتە : پێغەمبەر ﷺ بەهەشت و دۆزەخی بۆ بەرجەستە كرا لەسەر ئەو دیوارە ،وەكو شاشەیەكی تەلەفزیۆنی كەلەم سەردەمەدا هەیە ،ئەوەیش موعجیزەیەك بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ ( وەرگێڕ )**

**٨١٠٧- دەوارێك هەیە لە بەهەشتدا هەیە لە مرواری ناو بەتاڵە ، پانایيەكەی شەست ميلە ، لە هەموو گۆشەیەكيدا هاوسەری تيايە ئەوانی تر نابينن، بڕوادار بەسەریاندا دەسوڕێتەوە.**

( الصحيحة ٣٥٤١ )

٨١٠٨- في الجنة مائة درجة ما بين كل درجتين كما بين السماء و الأرض و الفردوس أعلاها درجة و منها تفجر أنهار الجنة الأربعة ومن فوقها يكون العرش فإذا سألتم الله فسلوه الفردوس.

( ش حم ت ك ) عن عبادة بن الصامت.

**٨١٠٨- لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە ، نێوان هەر دوو پلەیەكيان وەكو نێوان ئاسمان و زەوييە ،فيردەوسيش سەرووی بەهەشتەو، جێگای هەڵقولانی چوار ڕووبارەكەی بەهەشتە ، عەرشی خواش لە سەرەوەیەتی ، جا ئەگەر پارانەوە لە خوا داوای فيردەوسی لێ بكەن .**

( الصحيحة ٩٢٢ )

٨١٠٩- في الجنة مائة درجة ما بين كل درجتين مائة عام.

( ت ) عن أبي هريرة.

**٨١٠٩- لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە ، نێوان هەر دووپلەیەكی سەد ساڵە .**

( الصحيحة ٩٢٢ )

٨١١٠- في الجنة ما لا عين رأت و لا أذن سمعت و لا خطر على قلب بشر.

( البزار طس ) عن أبي سعيد.

**٨١١٠- ئەوەی لە بەهەشتدا هەیە ، نەچاو بينيويەتی و ، نەگوێ بيستويەتی و ،نەبە دڵی كەسيشدا هاتووە.**

( الصحيحة ١٠٨٦ )

٨١١١- الفردوس ربوة الجنة و أعلاها و أوسطها و منها تفجر أنهار الجنة.

( طب ) عن سمرة.

**٨١١١- فيردەوس بەرزايی و تە پۆڵكەی بەهەشتە و ناوەڕاستێتی ،لە وێشەوە ڕووبارەكانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن .**

( الصحيحة ٢٠٠٣ )

٨١١٢- قال الله تعالى: أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت و لا أذن سمعت و لا خطر على قلب بشر.

( حم ق ن ه ) عن أبي هريرة.

**٨١١٢- خوای گەورە دەفەرموێت : ئەوەی ئامادەم كردووە بۆ بەندە بڕوادارەكانم ،نە چاو بینیویەتی و ،نە گوێ بیستوویەتی و ،نە بە دڵی كەسدا هاتووە .**

( الروض ١١٠٦ )

٨١١٣- قد دنت مني الجنة حتى لو اجترأت عليها لجئتكم بقطاف من قطافها و دنت مني النار حتى قلت: أي رب و أنا معهم ؟ فإذا امرأة تخدشها هرة قلت: ما شأن هذه ؟ قالوا: حبستها حتى ماتت جوعا لا هي أطعمتها و لا أرسلتها تأكل من خشاش الأرض.

( خ ) عن أسماء بنت أبي بكر.

**٨١١٣- بەڕاستی ئەوەندە بەهەشتم لێ نزیك بوویەوە ،تەنانەت ئەگەر بم وترایە هێشویەكم لە هێشوەكانی بۆ دەهێنان ، ئەوندەش دۆزەخم لێ نزیك بوویەوە تاكو وتم : پەروەردگارم منیش لەگەڵیانم ؟ ئینجا ئافرەتێكم بینی پشیلە بە چنگی لێی دەدا ، وتم: ئەو ئافرەتە چی یەتی ؟ وتیان : ئەو پشیلەیەی زیندان كردبوو، تاكو كوشتی لە برسا ، نەئەوە بوو خواردنی پێ بدات ، نەئەوەبوو بەڕەڵای بكات لە زیندەوەری زەوی بخوات .**

( صحيح ابن ماجة ١٢٦٥ )

٨١١٤- قد رأيت الآن منذ صليت لكم الجنة و النار ممثلتين لي في قبل هذا الجدار فلم أر كاليوم في الخير و الشر.

( خ ) عن أنس.

**٨١١٤- ئێستا ، لەو كاتەوەی كە پێش نوێژیم بۆ ئێوە كرد دیمەنی بەهەشت و دۆزەخم لەو دیوارەدا بینی ،من هەرگیز وەكو ئەمڕۆ چاكەو خراپەم نەبینیوە .**

( المشكاة ٥٦٩٧ )

٨١١٥- قمت على باب الجنة فإذا عامة من دخلها المساكين و إذا أصحاب الجد محبوسون إلا أصحاب النار فقد أمر بهم إلى النار و قمت على باب النار فإذا عامة من يدخلها النساء.

( حم ق ن ) عن أسامة بن زيد.

**٨١١٥- لە دەرگای بەهەشتدا ڕاوەستا بوم ،بینیم زۆربەی ئەوانەی چوونەتە ناوی هەژارەكانن ،دەوڵەمەندەكانیشم بینی گیردرابون ،جگە لە دۆزەخییەكان نەبێت فەرمانیان پێكرا بەرەو دۆزەخ ،ئینجا لە دەرگای دۆزەخدا ڕاوەستام ،بینیم زۆربەی ئەوانەی دەچنە ناوی ئافرەتن .**

( الصحيحة ٢٥٨٦ )

٨١١٦- كل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبى من أطاعني دخل الجنة و من عصاني فقد أبى.
( خ ) عن أبي هريرة.

**٨١١٦- هەموو ئوممەتم دەچنە بەهەشتەوە مەگەر كەسێك خۆی ڕازی نەبێت ،هەركەس گوێڕایەڵیم بكات دەچێتە بەهەشتەوە و ،هەركەسیش لێم یاخی بێت ئەوە ڕازی نابێت .**

( الصحيحة ٣١٤١ )

٨١١٧- كل أهل الجنة يرى مقعده من النار فيقول: لولا أن الله هداني فيكون له شكر و كل أهل النار يرى مقعده من الجنة فيقول: لو أن الله هداني فيكون عليه حسرة.
( حم ك ) عن أبي هريرة.

**٨١١٧- هەموو ئەهلی بەهەشت جێگای خۆیان دەبینن لە دۆزەخدا و ،دەڵێن : تای ئەگەر خوا ڕێنموونی نەدەكردین ،ئەویش سوپاس كردنە بۆ ئەو ،هەموو خەڵكی دۆزەخیش جێگای خۆیان دەبینن لە بەهەشت و ، دەڵێن : خۆزگە خوای گەورە ڕێنموونی بكردایناية و ، ئەوەیش بۆیان دەبێتە پەژارە .**

( الصحيحة ٢٠٣٤ )

٨١١٨- كلكم يدخل الجنة إلا من شرد على الله شراد البعير على أهله.
( طس ك ) عن أبي أمامة.

**٨١١٨- هەموو كەسێك لە ئێوە دەچێتە بەهەشتەوە ،كەسێك نەبێت لە خوای گەورە یاخی بێت ،وەكو چۆن وشتر لە خاوەنەكەی بەلەسە دەبێت .**

( الصحيحة ٢٠٤٣ )

٨١١٩- لتدخلن الجنة إلا من أبى و شرد على الله كشراد البعير.
( ك ) عن أبي هريرة.

**٨١١٩- ئێوە دەچنە بەهەشتەوە ،كەسێك نەبێت پشت هەڵكات و ، لە خوای گەورە بەلەسە بێت ،وەكو چۆن وشتر بەلەسە دەبێت .**

( الصحيحة ٢٠٤٤ )

٨١٢٠- لقد دنت مني الجنة حتى لو اجترأت عليها لجئتكم بقطاف من قطافها و دنت مني النار حتى قلت: أي رب ! و أنا فيهم ؟ و رأيت امرأة تخدشها هرة لها فقلت: ما شأن هذه ؟ قال: حبستها حتى ماتت جوعا لا هي أطعمتها و لا هي أرسلتها تأكل من خشاش الأرض.

( حم ه ) عن أسماء بنت أبي بكر.

**٨١٢٠- بەهەشتم لێ نزیك بوویەوە ،تەنانەت ئەگەر بم ویستایە هێشویەكم لە هێشوەكانی بۆ دەهێنان ،ئاگریشم لێ نزیك بوویەوە تەنانەت وتم : پەروەردگار! منیش لەناویانم ؟ ئافرەتێكم بینی پشیلەیەك بە چنگی دەیڕنی ،وتم : ئەوە ئەو ئافرەتە چیەتی ؟ وتی : زیندانی كردبوو تاكو مرداربوەوە لە برسیەتیدا ،نە خواردنی پێدەدا و نە بەرەڵای دەكرد لە زیندەوەری زەوی بخوات .**

( صحیح ابن ماجة ١٢٦٥ )

٨١٢١- لقد رأيت الآن منذ صليت لكم: الجنة و النار ممثلتين في قبلة هذا الجدار فلم أر كاليوم في الخير و الشر.

( خ ) عن أنس.

**٨١٢١- ئا ئێستا كە پێش نوێژیم بۆ كردن ، دیمەنی بەهەشت و دۆزەخم بینی لەسەر ڕوی قیبلەی ئەو دیوارە ،هەرگیز خۆشی و ناخۆشی لەو شێوەیەم نەبینیوە وەكو ئەمڕۆ .**

( المشكاة ٥٦٧٩ )

٨١٢٢- لقيد سوط أحدكم من الجنة خير مما بين السماء و الأرض.

( حم ) عن أبي هريرة.

**٨١٢٢- بە ئەندازەی قاچی كەسێكتان لە بەهەشتدا ، لەوەی لە نێوان ئاسمان و زەویدا هەیە چاكترە .**

( الصحيحة ١٩٧٨ )

٨١٢٣- لما خلق الله الجنة قال لجبريل: اذهب فانظر إليها فذهب فنظر إليها ثم جاء فقال: أي رب ! و عزتك لا يسمع بها أحد إلا دخلها ثم حفها بالمكاره ثم قال: يا جبريل ! اذهب فانظر إليها فذهب ثم نظر إليها ثم جاء فقال: أي رب ! و عزتك لقد خشيت أن لا يدخلها أحد فلما خلق الله النار قال: يا جبريل ! اذهب فانظر إليها فذهب فنظر إليها ثم جاء فقال: و عزتك لا يسمع بها أحد فيدخلها فحفها بالشهوات ثم قال: يا جبريل اذهب فانظر إليها فذهب فنظر إليها فقال: أي رب و عزتك لقد خشيت أن لا يبقى أحد إلا دخلها.

( حم ٣ ك ) عن أبي هريرة.

**٨١٢٣- كاتێك خوای گەورە بەهەشتی درووست كرد بە جبریلی فەرموو : بڕۆ تەماشای بكە ،ئەویش ڕۆشت و تەماشای كردوو ، وتی : پەروەردگارم !سوێند بە شكۆداریت ، هیچ كەسێك نیە ئەوە ببیسێ و نەچێتە ناوی ، ئینجا بە نارەحەتی و ناخۆشی پەرژینی كرد، ئینجا فەرمووی : ئەی جبریل !بڕۆ تەماشای بكەرەوە ، ئەویش ڕۆیشت و ، تەماشای كردو، وتی :ئای پەروەردگارم ! سویند بە شكۆداریت ، دەترسم كەس نەچێتە ناوی ، كاتیكیش خوای گەورە دۆزەخی درووست كرد فەرمووی : ئەی جبریل بڕۆ تەماشای بكە ، ئەویش ڕۆیشت و تەماشای كردوو ، وتی : سوێند بە شكۆداریت ،هیچ كەسێك نیە باسی ئەوە ببیسێ بچێتە ناوی ، ئینجا بە ئارەزوو خۆشی پەرژینی كرد ، ئینجا فەرمووی : ئەی جبریل بڕۆ تەماشای بكە ، ئەویش ڕۆیشت و ، تەماشای كردو ،وتی : پەروەردگام سوێند بە شكۆداریت ، دەترسم كەس نەمێنێ نە چێتە ناوی .**

( المشكاة ٥٦٩٦ )

٨١٢٤- لن يدخل أحدا عمله الجنة و لا أنا إلا أن يتغمدني الله بفضل رحمته فسددوا و قاربوا و لا يتمنى أحدكم الموت إما محسن فلعله يزداد خيرا و إما مسيء فلعله أن يستعتب.

( ق ) عن أبي هريرة.

**٨١٢٤- كەس كردەوەكەی نایخاتە بەهەشتەوە ، تەنانەت منیش ، مەگەر خوای گەورە بە چاكەو میهرەبانی خۆی داماپۆشێت ، بۆیە كردەوەی چاكە بكەن و لێی نزیك ببنەوە ، بە گوێرەی تواناو ، با كەستان خۆزگە بە مردن نەخوازێت ، ئەگەر چاكە كارە بەڵكو چاكەی زۆرتر بكات ، ئەگەر خراپە كارەیش بێت بەڵكو بگەڕێتەوە لە خراپە كاری .**

( الصحيحة ٢٦٠٢ )

٨١٢٥- لو أن ما يقل ظفر مما في الجنة بدا لتزخرفت له ما بين خوافق السموات و الأرض و لو أن رجلا من أهل الجنة اطلع فبدا أساوره لطمس ضوء الشمس كماتطمس الشمس ضوء النجوم.

( حم ت ) عن سعد.

**٨١٢٥- ئەگەر ئەوەندەی لە نینۆكێك كەمتر لەوەی لە بەهەشتایە دەركەوێت هەرچی لەنێوان ئاسمانەكان و زەویدا هەیە خۆی بۆ دەڕازاندەوە ، ئەگەر پیاوێك لە خەڵكی بەهەشت دەركەوێت و بازنەكانی دەركەون ، ڕووناكی خۆر دەسڕێتەوە وەكو چۆن خۆر ڕووناكی ئەستێرەكان دەسڕێتەوە.**

( المشكاة ٥٦٣٧ )

**خوایەکی تر نییە و ،بڕیار دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە ،ئینجا با هەر پاڕانەوەیەکی پێ خۆشە هەڵی بژێرێت و بیکات .**

( الارواء ٣٣٥ )

٨٢٦٣- إن الله تعالى لا ينام و لا ينبغي له أن ينام يخفض القسط و يرفعه و يرفع إليه عمل الليل قبل عمل النهار و عمل النهار قبل عمل الليل حجابه النور لو كشفه لأحرقت سبحات وجهه ما انتهى إليه بصره من خلقه.

( م ه ) عن أبي موسى .

**٨٢٦٣- بێگومان خوای گەورە ناخەوێت و ناگونجێ بخەوێت ،بە دادگەری خۆیشی ڕۆزی کەم دەکات و زۆر دەکاتەوە ، کردەوەی شەوی پێش کردەوەی ڕۆژ بۆ بەرز دەکرێتەوە ، کردەوەی ڕۆژیشی پێش کردەوەی شەو بۆ بەرز دەکرێتەوە ، پەردەی لەڕووناکیە ،ئەگەر لاییدات مەزنی ڕووخساری تاکو چاو بڕیکات لە دروستکراوەکانی دەسوتێنێ .**

( ظلال الجنة٦١٤ )

٨٢٦٤- إن الله تعالى يقول: إن العز إزاري و الكبرياء ردائي فمن نازعني فيهما عذبته.

( طس ) عن علي .

**٨٢٦٤-بەڕاستی خوای گەورە دەفەرموێت : شکۆداری و مەزنی پۆشاکی منە، جا هەرکەسێك ململانێی ئەو دوو شتەم لەگەڵدا بکات ئەشکە نجەی دەدەم .**

( الصحيحة ٥٤٠ )

٨٢٦٥- إن الله ينشئ السحاب فينطق أحسن النطق و يضحك أحسن الضحك.

( حم هق في الأسماء ) عن شيخ من بني غفار .

**٨٢٦٥- بەڕاستی خوای گەورە هەور دروست دەکات و بە باشترین شێوە قسەدەکات و ،بە جوانترین شێوە پێدەکەنێ.**

( الصحيحة ١٦٦٥ )

٨٢٦٦- إن ربكم حيي كريم يستحي أن يبسط العبد يديه إليه فيردهما صفرا.

( د ه ) عن سلمان .

**٨٢٦٦- بەڕاستی پەروەردگارتان بە شەرم و بەخشندەیە ،شەرم دەکات بەندەکەی هەردوو دەستی بەرز بکاتەوە و ،بە تاڵی بیانگێڕێتەوە .**

( المشكاة ٢٢٤٤ )

٨٢٦٧- إن لله تعالى تسعة و تسعين اسما مائة إلا واحدا من أحصاها دخل الجنة.

( ق ت ه ) عن أبي هريرة ( ابن عساكر ) عن عمر .

**٨٢٦٧- بەڕاستی خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە لە سەد یەكێكی كەمە هەركەسێك ئەژماریان بكات دەچێتە بەهەشتەوە .**

( المشكاة ٢٢٨٨ )

٨٢٦٨- إن لله تعالى تسعة و تسعين اسما مائة غير واحد لا يحفظها أحد إلا دخل الجنة و هو وتر يحب الوتر.

( ق ) عن أبي هريرة .

**٨٢٦٨- بەڕاستی خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە سەد یەكێك نەبێت هەركەسێك لەبەری بكات حەتمەن دەچێتە بەهەشتەوە ،خۆیشی تاكەو تاكی خۆش دەوێت .**

( المشكاة ٢٢٨٨ )

٨٢٦٩- إن يمين الله ملأى لا يغيضها نفقة سحاء الليل و النهار أرأيتم ما أنفق منذ خلق السموات و الأرض ؟ فإنه لم يغض ما في يمينه و عرشه على الماء و بيده الأخرى القبض يرفع و يخفض.

( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٨٢٦٩- دەستی ڕاستی خوای گەورە پڕە ،بەخشین كەمی ناكاتەوە ،بەخشەرە بە شەو بە ڕۆژ ،ئەی نازانن لەو ڕۆژەوە ئاسمانەكان و زەوی دروست كردووە چەندی بەخشیوە ؟ ئەوە هیچی لە دەستی ڕاستی كەم نەكردووەتەوە ،عەرشەكەشی لەسەر ئاوە ،بەدەستەكەی تریشی خەڵكی دەگرێت و بەرز دەكاتەوە و ، نزم دەكاتەوە .**

( الصحيحة ٣٥٥٠ )

٨٢٧٠- إنكم سترون ربكم كما ترون هذا القمر لا تضامون في رؤيته فإن استطعتم أن لا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس و صلاة قبل غروبها فافعلوا.

( حم ق ٤ ) عن جرير .

**٨٢٧٠- بێگومان ئێوە پەروەردگارتان دەبینن وەكو چۆن ئەو مانگە دەبینن هیچ قەرەباڵغی[1]نیە لە بینیندا ،جا ئەگەر توانیتان نوێژ بكەن پێش هەڵاتنی خۆر وابكەن ، یان نوێژ لە پێش ڕۆژئاوا بوون بكەن .**

(صحيح الترمذي ٢٥٥٤ )

---

[1] **وشەی (( تضامون )) بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە : أ- ( تضامُّون ) واتە قەرەباڵغی و سمڕ سمڕ نابێ لە كاتی بینیندا . ب-( تضامُوْن ) بەبێ شەددە واتە ستەمركدن نیە لە بینیندا واتە هەندێك بینن و هەندێك نەبینن . النهاية في الغريب الحديث و الأثر ج٢ ص٩٣ ط٣ .**

٨٢٧١- إنكم لن تروا ربكم عز و جل حتى تموتوا.

( طب في السنة ) عن أبي أمامة .

**٨٢٧١- ئێوه هەرگیز پەروەردگارتان نابینن تاکو نەمرن .**

( ظلال الجنة ٤٣١ )

٨٢٧٢- ما من قلب إلا و هو معلق بين إصبعين من أصابع الرحمن إن شاء أقامه و إن شاء أزاغه و الميزان بيد الرحمن يرفع أقواما و يخفض آخرين إلى يوم القيامة.

( حم ه ك ) عن النواس.

**٨٢٧٢- هەرچی دڵ هەیە هەڵواسراوە لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای بەزەییدا، گەر بیەوێت ڕاوەستاوی دەکات یان لە خشتەی دەبات ،ترازوویش بەدەستی خوای گەورەیە کەسانێکی پێ بەرز دەکاتەوە و ، کەسانێکی پێ نزم دەکاتەوە تاکو ڕۆژی قیامەت .**

( السنة ٢١٩ )

٨٢٧٣- بل الله يخفض و يرفع و إني لأرجو أن ألقى الله و ليس لأحد عندي مظلمة.

( د هق ) عن أبي هريرة .

**٨٢٧٣- بەڵکو خوای گەورە بەرزکەرەوەو و نزمکەرەوەیە ،منیش ئومێدەوارم خوای گەورە ببینم و هیچ کەسێك مافی داگیرکراوی کەسم لەسەرم نەبێت .**

( الروض النضير ٤٠٥ )

٨٢٧٤- تعلموا أنه لن يرى أحد منكم ربه حتى يموت.

( م ن ) عن رجل .

**٨٢٧٤- ئەوە بزانن کە هەرگیز هیچ یەکێك لە ئێوە پەروەردگاری خۆی نابینێ تاکو نەمرێت .**

( الصحيحة ٢٨٦٢ )

٨٢٧٥- ثلاثة لا تسأل عنهم: رجل ينازع الله إزاره و رجل ينازع الله رداءه فإن رداءه الكبرياء و إزاره العز و رجل في شك من أمر الله و القنوط من رحمة الله.

( خد ع طب ) عن فضالة بن عبيد.

**٨٢٧٥- سێ شت هەیە پرسیاریان دەربارە مەکە : کەسێك ململانێ لەگەڵ خوای گەورە بکات ،لەسەر شکۆداری و مەزنیدا ، پیاوێکیش بە گومان بێت لە خوای پەروەردگار ، کەسێکیش بێ ئەومێد بێت لە خوای گەورە .**

( الصحيحة ٧٤١ )

٨٢٧٦- رأيت ربي عز و جل.

( حم ) عن ابن عباس

**٨٢٧٦- پەروەردگاری دەسەلاتدار و شكۆداری خۆم بینی [1] .**

( السنة ٥٤١ )

٨٢٧٧- السيد الله.

( حم د ) عن عبدالله بن الشخير.

**٨٢٧٧- سەردار خوایە . [2]**

( اصلاح المساجد ١٠٣ )

٨٢٧٨- إذا مضى شطر الليل أو ثلثاه ينزل الله إلى السماء الدنيا فيقول: هل من سائل فيعطى ؟ هل من داع فيستجاب له ؟ هل من مستغفر فيغفر له ؟ حتى ينفجر الصبح.

( م ) عن أبي هريرة .

**٨٢٧٨- ئەگەر نیوە یان دوو لەسەر سێی شەو تێنەپەڕێ ،خوای گەورە دێتە ئاسمانی دونیاو ،دەفەرموێت : ئایا داواكارێك هەیە پێی ببەخشرێ ؟ ئایا هیچ كەسێك هەیە بپاڕێتەوە هەیە وەڵامی بدەمەوە ؟ ئایا كەسێك هەیە داوای لێخۆش بوون بكات و ،لێی خۆش بم ؟ تاكو بەرەبەیان .**

( الترغيب ١٦٤٦ )

٨٢٧٩- ضحك الله من رجلين قتل أحدهما صاحبه و كلاهما في الجنة .

( حب ) عن أبي هريرة.

**٨٢٧٩- خوای گەورە پێدەكەنێت بە دوو پیاو یەكێكیان ئەوی تریان دەكوژێت و ، هەردووكیشیان لە بەهەشتدان.**

( الصحيحة ١٠٧٤ )

٨٢٨٠- ضحك ربنا من قنوط عباده و قرب غِيَرِه.

( حم ه ) عن أبي رزين.

---

[1] واتە : لە خەودا وەكو مامۆستامان وتوویەتی و ، لە چەند ڕیوایەتێكی تردا هاتووە .

[2] وشەی ( سید ) قەدەغەیە بەكارهێنانی ئەگەر مەبەست خۆ بە مەزن دانان بێت ،ئەگەر نا بۆ ناساندنی ئاساییە .

٨٢٨٠- پەروەردگارمان پێدەکەنێت [1] لە بێ هیوایی بەندەکانی و ،نزیکی دەرو کردنەوەی خۆی .

( الصحيحة ٢٨١٠ )

٨٢٨١- الشهداء الذين يقاتلون في سبيل الله في الصف الأول و لا يلتفتون بوجوههم حتى يقتلوا فأولئك يلقون في الغرف العلا من الجنة يضحك إليهم ربك إن الله تعالى إذا ضحك إلى عبده المؤمن فلا حساب عليه.

( طس ) عن نعيم بن هبار ويقال همار.

٨٢٨١- ئەو شەهیدانەی دەجەنگن لە پێناو خوادا لە ڕیزی یەکەمن ،ڕووشیان وەرناگێڕن تاکو دەکوژرێن ،ئەوانە دەخرێنە ژووره بەرزەکانی بەهەشت و ، پەروەردگاریان بۆیان پێدەکەنێت ،خوای گەورە ئەگەر پێکەنێت بۆ بەندە بڕوادارەکەی ئیتر هیچ لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت .

( الترغيب ٢٣٧٢ )

٨٢٨٢- عجب ربنا من قوم يقادون إلى الجنة في السلاسل .

( حم خ د ) عن أبي هريرة.

٨٢٨٢- پەروەردگارمان سەیری دێت لە کەسانێك بە کۆت و زنجیرەوە بەرەو بەهەشت دەبرێن [2] .

( السنة ٥٧٣ )

٨٢٨٣- قال الله تعالى: الكبرياء ردائي فمن نازعني في ردائي قصمته.

( ك ) عن أبي هريرة.

٨٢٨٣- خوای گەورە دەفەرموێت : گەورەیی و مەزنی دوو پارچە پۆشاکی منە و ، هەرکەسێك ململانێی ئەوەم لەگەڵدا بکات پشتی دەشکێنم .

( الصحيحة ٥٤٠ )

٨٢٨٤- قال الله تعالى: الكبرياء ردائي و العز إزاري فمن نازعني في شيء منهما عذبته.

( سمويه ) عن أبي سعيد وأبي هريرة.

٨٢٨٤- خوای گەورە دەفەرموێت : گەورەیی کراس و مەزنی شڕواڵی منە منە و ، هەرکەسێك ململانێی ئەوەم لەگەڵدا بکات سزای دەدەم .

( الصحيحة ٥٤٠ )

[1] پێکەنین یەکێکە لە سیفەتەکانی خوای گەورە ،ئەهلی سوننەت جێگەی دەکەن بۆی

[2] واتە ئەو دیلانەی موسڵمان دەبن .

٨٢٨٥- قال الله تعالى: الكبرياء ردائي و العظمة إزاري فمن نازعني واحدا منهما قذفته في النار.

( حم د ه ) عن أبي هريرة ( ه ) عن ابن عباس

**٨٢٨٥- خوای گەورە دەفەرموێت : گەورەیی و مەزنی پۆشاکی منە و ،جا هەرکەسێك ململانێی یەکێك لەوانەم لەگەڵدا بکات دەی خەمە دۆزەخەوە .**

( الصحيحة ٥٤٠ )

٨٢٨٦- قال الله تعالى: كذبني ابن آدم و لم يكن له ذلك و شتمني و لم يكن له ذلك فأما تكذيبه إياي فزعم أني لا أقدر أن أعيده كما كان و أما شتمه إياي فقوله: لي ولد فسبحاني أن أتخذ صاحبة أو ولدا.

( خ ) عن ابن عباس.

**٨٢٨٦- خوای گەورە دەفەرموێت : ئادەمیزاد بەدرۆم دەخاتەوە بۆی نیە ئەوەش بکات ، جنێوم پێ دەدات و ،بۆی نییە ئەوەش بکات ،بە درۆ خستنەوەی بۆ من ئەوەیە ،بانگەشە دەکات کە گوایا ناتوانم دوبارە دروستی بکەمەوە وەکو خۆی ،جنێو دانیشی بەمن ئەوەیە دەڵێت : من کوڕم هەیە ، پاك و پیگەردی بۆ من چۆن هاوسەرو منالم دەبێت.**

( المشكاة ٢٠ )

٨٢٨٧- ليس أحد أصبر على أذى سمعه من الله تعالى إنهم ليدعون له ولدا و يجعلون له أندادا و هو مع ذلك يعافيهم و يرزقهم.

( ق ) عن أبي موسى.

**٨٢٨٧- کەس بەئارامتر نییە بۆ بیستنی قسەی نابەجێ هێندەی خوای گەورە ،چونکە دەڵێن منالی هەیەو هاوتای بۆ پەیدا دەکەن و ،لەگەڵ ئەویشدا ساغ و سەلامەت و ئاسودەیان دەکات و ڕۆزیان دەدات .**

( الصحيحة ٢٢٤٩ )

٨٢٨٨- ليس لله شريك.

( د ) عن والد أبي المليح.

**٨٢٨٨- خوای گەورە هاوبەشی نییە .**

( الارواء ١٥٢٠ )

٨٢٨٩- ما منكم من أحد إلا سيكلمه الله يوم القيامة ليس بينه و بينه ترجمان فينظر أيمن منه فلا يرى إلا ما قدم و ينظر أشأم منه فلا يرى إلا ما قدم و ينظر بين يديه فلا يرى إلا النار تلقاء وجهه فاتقوا النار و لو بشق تمرة و لو بكلمة طيبة.

( حم ق ت ه ) عن عدي بن حاتم.

**٨٢٨٩- هیچ کەسێك نیە لە ئێوە کە خوای گەورە بەبێ وەرگێڕ قسەی لەگەڵ نەکات لە ڕۆژی قیامەتدا ، جا تەماشای لای ڕاستی دەکات هەر کردەوەکانی خۆی دەبینێت ،تەماشای لای چەپی دەکات هەر کردەوەکانی خۆی دەبینێت ،تەماشای پێشی دەکات تەنها ئاگر دەبینێت ،بۆیە خۆتان لە دۆزەخ بپارێزن ئەگەر بە لەتکە خورمایەکیش بێت یان ،ئەگەر بە قسەیەکی چاکیش بێت .**

( مشكلة الفقر ٢١٥ )

٨٢٩٠- الميزان بيد الرحمن يرفع أقواما و يضع آخرين.

( البزار ) عن نعيم بن همار.

**٨٢٩٠- تەرازوو بەدەستی خوای گەورەیە کەسانێك بەرز دەکاتەوەو ،کەسانێکیش نزم دەکاتەوە .**

( السنة ٤٥٠ )

٨٢٩١- هل تضارون في رؤية الشمس بالظهيرة صحوا ليس معها سحاب ؟ و هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر صحوا ليس فيها سحاب ؟ ما تضارون في رؤية الله يوم القيامة إلا كما تضارون في رؤية أحدهما إذا كان يوم القيامة أذن مؤذن: ليتبع كل أمة ما كانت تعبد فلا يبقى أحد كان يعبد غير الله من الأصنام و الأنصاب إلا يتساقطون في النار حتى إذا لم يبق إلا من كان يعبد الله من بر و فاجر و غير أهل الكتاب فيدعى اليهود فيقال لهم: ما كنتم تعبدون ؟ قالوا: كنا نعبد عزيرا ابن الله ! فيقال: كذبتم ما اتخذ الله من صاحبة و لا ولد فماذا تبغون ؟ قالوا: عطشنا يا ربنا فاسقنا فيشار إليهم: ألا تردون ؟ فيحشرون إلى النار كأنها سراب يحطم بعضها بعضا فيتساقطون في النار " ثم يدعى النصارى فيقال لهم: ما كنتم تعبدون ؟ قالوا: كنا نعبد المسيح ابن الله ! فيقال لهم: كذبتم ما اتخذ الله من صاحبة و لا ولد فيقال لهم: ماذا تبغون ؟ فيقولون: عطشنا يا ربنا فاسقنا فيشار إليهم: ألا تردون؟ فيحشرون إلى جهنم كأنها سراب يحطم بعضها بعضا فيتساقطون في النار حتى إذا لم يبق إلا من كان يعبد الله من بر و فاجر أتاهم رب العالمين في أدنى صورة من التي رأوه

فيها قال: فما تنتظرون ؟ تتبع كل أمة ما كانت تعبد قالوا: يا ربنا فارقنا الناس في الدنيا أفقر ما كنا إليهم و لم نصاحبهم فيقول: أنا ربكم فيقولون: نعوذ بالله منك لا نشرك بالله شيئا مرتين أو ثلاثا حتى إن بعضهم ليكاد أن ينقلب فيقول: هل بينكم و بينه آية فتعرفونه بها ؟ فيقولون: نعم الساق فيكشف عن ساق فلا يبقي من كان يسجد لله من تلقاء نفسه إلا أذن الله له بالسجود و لا يبقى من كان يسجد اتقاء و رياء إلا جعل الله ظهره طبقة واحدة كلما أراد أن يسجد خر على قفاه ثم يرفعون رءوسهم و قد تحول في الصورة التي رأوه فيها أول مرة فيقول: أنا ربكم فيقولون: أنت ربنا " ثم يضرب الجسر على جهنم و تحل الشفاعة و يقولون: اللهم سلم سلم قيل: يا رسول الله و ما الجسر ؟ قال: دحض مزلة فيه خطاطيف و كلاليب و حسكة تكون بنجد فيها شويكة يقال لها: السعدان فيمر المؤمنون كطرف العين و كالبرق و كالريح و كالطير و كأجاويد الخيل و الركاب فناج مسلم و مخدوش مرسل و مكدوس في نار جهنم حتى إذا خلص المؤمنون من النار فوالذي نفسي بيده ما من أحد منكم بأشد مناشدة لله في استيفاء الحق من المؤمنين لله يوم القيامة لإخوانهم الذين في النار يقولون: ربنا كانوا يصومون معنا و يصلون و يحجون فيقال لهم: أخرجوا من عرفتم فتحرم صورهم على النار فيخرجون خلقا كثيرا قد أخذت النار إلى نصف ساقه و إلى ركبتيه فيقولون: ربنا ما بقي فيها أحد ممن أمرتنا به " فيقول الله عز و جل: ارجعوا فمن وجدتم في قلبه مثقال دينار من خير فأخرجوه فيخرجون خلقا كثيرا ثم يقولون ربنا لم نذر فيها أحدا ممن أمرتنا به " ثم يقول: ارجعوا فمن وجدتم في قلبه مثقال نصف دينار من خير فأخرجوه فيخرجون خلقا كثيرا ثم يقولون: ربنا لم نذر فيها ممن أمرتنا أحدا ثم يقول: ارجعوا فمن وجدتم في قلبه مثقال ذرة من خير فأخرجوه فيخرجون خلقا كثير ثم يقولون: ربنا ! لم نذر فيها خيرا فيقول الله: شفعت الملائكة و شفع النبيون و شفع المؤمنون و لم يبق إلا أرحم الراحمين فيقبض قبضة من النار فيخرج منها قوما لم يعملوا خير قط قد عادوا حمما فيلقيهم في نهر في أفواه الجنة يقال له: نهر الحياة فيخرجون كما تخرج الحبة في حميل السيل ألا ترونها تكون إلى الحجر أو الشجر ما يكون إلى الشمس أصيفر و أخيضر و ما يكون منها إلى الظل يكون أبيض فيخرجون كاللؤلؤ في رقابهم الخواتيم يعرفهم أهل الجنة: هؤلاء عتقاء الله من النار الذين أدخلهم الجنة بغير عمل عملوه و لا خير قدموه ثم يقول: أدخلوا الجنة فما رأيتموه فهو لكم فيقولون: ربنا أعطيتنا ما لم

تعط أحدا من العالمين فيقول: لكم عندي أفضل من هذا ؟ فيقولون: يا ربنا أي شيء أفضل من هذا ؟ فيقول: رضاي فلا أسخط عليكم بعده أبدا.

( حم ق ) عن أبي سعيد.

**٨٢٩١- ئایا کەس گرفتی هەیە لەکاتی تەماشاکردنی خۆر بە نیوەڕۆی ساماڵ و بێ هەور؟ ئایا کەس گرفتی هەیە لە بینینی مانگ لە شەوی چواردەدا کە ئاسمان ساماڵ و بێ هەور بێت ؟ هەر ئاواش کەس کەس گرفتی نیە لە بینینی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ،هەر وەکو ئەوەی کە گرفتێکیان نیەلە کاتی تەماشاکردنی ڕۆژ و مانگدا ،لە ڕۆژی قیامەتدا جاڕدەرێك بانگ دەکات : با هەموو ئوممەتێك شوێن پەرستراوەکەی بکەوێت ،ئیتر کەس نامێنێتەوە لەوانەی جگە لە خوا شتی تریان دەپەرستوەکە نەکەونە ناو ئاگری دۆزەخەوە ،ئیتر کەس نامێنێتەوە جگە لەوانەی کە خوای گەورەیان پەرستووە لە چاکە کارو خراپە کارو ، پاش ماوەی خاوەن پەڕاوەکان ،جولەکەکان بانگ دەکرێن و پێیان دەوترێت : چیتنان دەپەرست ؟ دەڵێن : عوزەیری کوڕی خوامان دەپەرست ! پێیان دەوترێت : درۆتان کرد خوا هاوسەرو منالی نییە ، چیتان دەوێت ؟ وتیان : تینوومانە پەروەردگار تێر ئاومان بکە . ئاماژەیان بۆ دەکرێت : ئایا وەلام نادەنەوە ؟ ئینجا کۆدەکرێنەوە بەرەو دۆزەخ دەڵێی دەشتی پانوپۆڕن تراویلکەن یەکتر دادەشێلن تا دەکەونە ناو دۆزەخ .ئینجا گاورەکان بانگ دەکرێن و ،پێیان دەوترێت : چی تان دەپەرست ؟ دەڵێن : مەسیحی کوڕی خوامان دەپەرست ! پێیان دەوترێت : درۆتان کرد خوای گەورە هاوسەرو منالی نەبووە ،پێیان دەوترێت : چیتان دەوێت ؟ دەڵێن : تینوومانە ئەی پەروەردگار ئاومان پێ بدە ،ئاماژەیان بۆ دەکرێت : ئەرێ وەلام نادەنەوە ؟ ئیتر بەرەو دۆزەخ ،دەڵێی دەشتی پان و پۆڕن و تراویلکەن یەکتر دادەشێلن تا دەکەونە ناو دۆزەخ ،ئینجا کەس نامێنێتەوە جگە لە وانەی تەنها خوایان پەرستووە لە چاکە کارەکان و خراپەکارەکان ، پەروەردگاری جیهان دێتە لایان ،لە ڕوواڵەتێکی سادەتر لەوەی کە بینیویانە ،دەفەرموێت : چاوەڕوانی چین ؟ وا هەموو ئوممەتێك شوێنی پەرستراوی خۆی دەکەوت ،دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان لە خەڵکی دابڕاین و پێویستمان پێیان بوو ،هاوڕێیەتی ئەوانمان نەکرد ،دەفەرموێت : من پەروەردگارتانم ،ئەوانیش دەڵێن : پەنا بە خوا دەگرین لە تۆ ،ئێمە هاوبەش بۆ پەروەردگارمان بڕیار نادەین( دوو**

جار یان سێ جا ئەوە دەڵێن ) تەنانەت هەنێکیان خەریکە پاش گەز ببنەوەو دەفەرموێت : ئایا نیشانەیەك هەیە لەنێوانتاندا پێی بناسنەوە ؟ دەڵێن : بەڵێ لاقی ، ئەویش لاقی دەردەخات [1] ئیتر کەس نامێنێت لە وانەی لە ویستی خۆیان سوژدەیان بۆ خوا بردووە کە خوای گەورە مۆڵەتی سوژدە بردنی پێ نەدات ،هەرکەسیش سوژدەی بە ڕوپامایی بردبێت خوای گەورە پشتی دەکاتە یەك پارچە ،کە دەیەوێت سوژدە ببات بە پشتا دەکەوێت ،ئینجا سەریان بەرز دەکەنەوەو ،دەبینن چۆتەوە سەرشێوەکەی یەکەم جاری کە بینویانە ،دەفەرموێت : من پەروەردگارتانم ،ئەوانیش دەڵێن : تۆ پەروەردگارمانی .ئینجا پردەکە لەسەر لەسەر دۆزەخ لێ دەدرێت و ،تکا کردن دەست پێدەکات ،دەڵێن : خوایە سەلامەتمان بکەیت سەلامەتمان بکەیت دەوترێت: ئەی پێغەمبەری خوا ، پرد چی یە ؟ دەفەرموێت : جێگای پێ خلیسکانە و ،قولاپ و دڕك و ، گیا دڕنەی [2] دڕکاوی تیایە کە ،سەعدانی پێ دەوترێت ،بڕواداران بەسەریدا تێپەڕدەبن وەکو چاو تروکان و تریشقەو باو باڵدار و ئەسپ بۆڕدەر [3] و وشتری خێرا ،جا لێیان دەرباز دەبێت و سەلامەت دەبێت ،لێشیان بە بریندار ڕزگار دەکرێت و بەردەدرێت ،لێشیاندا هەیە دەکەونە ناو ئاگری دۆزەخ لەوێدا سەریەك دەنیشن ،تاکو ئیمانداران لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێت ،سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێك لە ئێوە هاوار بۆ خوای گەورە ناکات ئەوەندەی کە ئەو بڕوادارانە لە ڕۆژی قیامەتدا دەپاڕێنەوە بۆ ئەو برایانەیان کە لە دۆزەخدان ،دەڵێن : پەروەردگارمان ئەوانە لەگەڵ ئێمە ڕۆژوویان دەگرت ،نوێژو حەجیان دەکرد ، پێیان دەوترێت : ئەوانەی دەیان ناسن دەریان هێنن ،ئیتر ناوچاوانیان قەدەغە دەبێت لە دۆزەخ ،ئینجا کەسانێکی زۆر لە دۆزەخ دەردەهێنن ئاگر تا نیوەی لاقیان ڕۆیشتووە یان تاکو ئەژنۆیان ،دەڵێن : پەروەردگار کەسی تیا نەماوە لەوانەی فەرمانت پێکردین ،خوای گەورە دەفەرموێت : بگەڕێنەوە ئەوەی بینیتان ئەوەندەی مسقاڵێك ئاڵتوون چاکەی لە دڵدایە دەری بهێنن ،ئیتر

---

[1] واتە خوای گەورە لاقی خۆی دەردەخات ئەمەیش لە فەرموودەکانی ( الصفات )ە کە ئەهلی سوننەت باوەڕیان پێیەتی بێ شێواندن و بەجەستەکردن و چۆنیەتی .

[2] کسك : گیایکە بەرێکی زبرو تڕن و دڕکاوی هەیە بە خوری و کولکی مەڕو وشترەوە دەهاڵێ ، قاموسی رستە ب١ ل٤٥٥ ج١ .

[3] ئەونەسپەی لە گەووا پێش بڕکێدا هەمیشە براوەیە و نادۆڕێ . النهاية في الغريب الحديث و الأثر ج١ ص٣٠٥ ط٣ .

**خەڵکێکی زۆر دەردەهێنن و ،دەڵێن : پەروەردگار هیچ کەسێکمان لە دۆزەخدا بەجێ نەهێشتووە ،لەوانەی فەرمانت کرد ،ئینجا دەفەرموێت : بگەڕێنەوە ،ئەوەی بینیتان ئەوەندەی نیو مسقاڵ ئاڵتوون چاکەی تێدا شك دەبەن دەریبهێنن ،ئیتر خەڵکێکی زۆر دەردەهێنن و ،دەڵێن : کەسمان لە دۆزەخدا بەجێ نەهێشتوە لەوانەی فەرمانت پێکردین، دەفەرموێت : بگەڕێنەوە هەرکەسێکتان بینی ئەوەندەی پارچە گەردیلەیك چاکەی لە دڵدایە دەریبهێنن ،ئیتر خەڵکێکی زۆر دەردەهێنن ،ئینجا دەڵێن : کەسمان بەجێنەهێشتوو لەوانەی فەرمانت کرد ،خوای گەورە دەفەرموێت : فریشتەکان و پێغەمبەران و بڕواداران تکایان کرد ،تەنها بەسۆزترینی بەسۆزەکان ماوە ،ئیتر یەك مشتبە مشتی خۆی لە دۆزەخ دەر دەهێنێت کە هەرگیز چاکەیان نەکردووە و ،بوونەتە خەڵووز ،دەیان خاتە ڕووبارێك لەلای بەهەشتدا پێی دەوترێت : ڕووباری ژیان ،کە لە ڕوبارەکە دێنە دەر وەکو ئەو تۆوەن کە لافاو لایدەدات سپی و ناسك و بێگەردە ،ئایا نابینن بەردێك یا خۆر زەردو سەوزە دەبێت ،ئەوەشی لە بن سێبەردایە و سپی دەبێت ، ئیتر وەکو مرواری دەردەچن ،ملوانکەیان لە گەردندایە ،خەڵکی بەهەشت دەیان ناستەوە: ئەوانە ئازاد کراوانی خوای گەورەن لە دۆزەخ خراونەتە بەهەشتەوە بە بێ هیچ کردەوەیەك کردبێتیان ،یان چاکەیەك کە ئەنجامیان دابێت ئینجا دەفەرموێت : بچنە بەهەشتەوە ،ئەوەیشی دەیبینن موڵکی خۆتانە ،دەڵێن : پەروەردگار ئەوەی بە ئێمەت بەخشیوە بە کەست نەبەخشیوە لە جیهانیاندا دەفەرموێت : لەوەش باشترتان پێ دەبەخشم ،دەڵێن پەرومردگار چی لەوە چاکترە ؟ دەفەرموێت : ڕەزامەندی من ئاوایە ، ئیتر هەرگیز لێتان تووڕە نابم .**

( الترغيب ٣٦١١ )

٨٢٩٢- هل تضارون في رؤية الشمس في الظهيرة ليست في سحابة ؟ هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر ليس في سحابة ؟ فوالذي نفسي بيده لا تضارون في رؤية ربكم عز و جل إلا كما تضارون في رؤية أحدهما فيلقى العبد فيقول: أي فل ألم أكرمك و أسودك و أزوجك و أسخر لك الخيل و الإبل و أذرك ترأس و تربع ؟ فيقول: بلى أي رب فيقول: أفظننت أنك ملاقي ؟ فيقول: لا فيقول: إني أنساك كما نسيتني " ثم يلقى الثاني فيقول له: أي فل ؟ ألم أكرمك و أسودك و أزوجك و أسخر لك الخيل و الإبل و أذرك ترأس و تربع ؟ فيقول: بلى أي رب ! فيقول: أفظننت

أنك ملاقي ؟ فيقول: لا فيقول: إني أنساك كما نسيتني " ثم يلقى الثالث فيقول له مثل ذلك فيقول: رب آمنت بك و بكتابك و برسلك و صليت و صمت و تصدقت و يثني بخير ما استطاع فيقول: هاهنا إذن ثم يقال: الآن نبعث شاهدا عليك و يتفكر في نفسه: من ذا الذي يشهد علي ؟ فيختم على فيه و يقال لفخذه: انطقي فتنطق فخذه و لحمه و عظامه بعمله و ذلك ليعذر من نفسه و ذلك المنافق الذي يسخط الله عليه.

( م ) عن أبي هريرة.

**٨٢٩٢- ئایا هیچ یان هیچ زەحمەتێك دەگەیەنن زەحمەتێك دەبینن لە بینینی خۆر لە کاتی نیوەڕۆدا کە ،هەور بە ئاسمانەوە نەبێت ؟ ئایا هیچ زەحمەتێك دەبینن لە بینینی مانگی چواردە کاتێك هەور بە ئاسمانەوە نەبێت ؟ دە سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە هیچ زەحمەتێکیش نابینن لە بینینی پەروەردگارتان هەروەکو چۆن زەحمەتتان نابینن بە بینینی ئەو دووانە ،بە بەندە دەگات و و پێی دەفەرموێت : ئەی فلانی[1] ئایا ڕێزم لێ نەگرتیت و نەم کردی بە سەردار و ،هاوسەرم پێ نەدایت و ،ئەسپ و وشترم بۆ مل کەچ نەکردیت و ،بوارم نەدایت ببیتە سەرۆکی هۆزەکەت و چوار یەکی دەسکەوت [2]ببەیت ؟ دەڵێ : بەڵێ ئەی پەروەردگارم ،دەفەرموێت : ئایا دەتزانی ڕووبەڕووی من دەبیتەوە ؟ دەڵێت : نەخێر ،دەفەرموێت : دە بەڕاستی منیش تۆ لە یاد دەکەم وەکو چۆن تۆ منت لە یاد کرد ،ئینجا بە دووەم دەگات وپێی دەفەرموێت : ئەی فلانەکەس ؟ ئایا ڕێزم لێ نەگرتیت و نەم کردی بە سەرداروو ، هاوسەرم پێ نەبەخشیت و ،ئەسپ و وشترم بۆ مل کەچ نەکردیت و ،نەمکردیت بە گەورەی هۆزەکەت و چوار یەکی دەسکەوت نەبرد ؟ دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم ،دەفەرموێت : ئایا دڵنیا بووی کە ڕووبەڕووی من دەبیتەوە؟ دەڵێ : نەخێر ، دەفەرموێت : دە بەڕاستی منیش تۆ لە یاد دەکەم وەکو چۆن تۆ منت لە یاد کرد ،ئینجا سێ یەم کەس دەبینێت و هەمان قسەی پێ دەفەرموێت و ، دەڵێت : پەروەردگارم باوەڕم بە تۆو کتێبەکەت و پێغەمبەرەکانت هێناو ،نوێژم کرد و ڕۆژووم گرت و ،زەکاتم دەداو ،تا دەتوانێت ستایشی چاکە دەکات ،دەفەرموێت : ئالێرەدا[3]**

---

[1] ای فل : ای فلان واتە فلانی یان فلانە کەس .. السراج المنیر ج٢ ص٣٣٣ .

[2] چواریەکی دەستکەوت لەسەر دەمی نەفامیدا دەدرا بە پاشاو سەرۆکەکان . السراج المنیر ج٢ ص٣٣٣

[3] واتە : ئا ئەلێرە درۆی ئاوا دەکەی و بانگەشەی شتی وا دەکەیت .

**ئاوها: ئینجا پێی دەوترێت : ئێستا شایەتێکت بۆ دێنین لە خۆت و ئەویش بیر دەکاتەوە لە خۆی ، ئەبێ کێ بێت شایەتیم لەسەر بدات ؟ ئیتر دەمی مۆر دەکرێت و بە ڕانی دەوترێت: قسەبکە ،ئیتر ڕانی و گۆشت و ئێسقانی دێنە باسکردنی کردەوەکانی ، ئەویش بۆ ئەوەی بیانوی نەمێنێت ،ئەویش ئەو دوڕوەیە کە خوای گەورە لێی تووڕە دەبێت .**

( الترغيب ٣٦٠٩ )

٨٢٩٣- هل تمارون في القمر ليلة البدر ليس دونه سحاب ؟ هل تمارون في رؤية الشمس ليس دونها سحاب ؟ فإنكم ترونه كذلك يحشر الله الناس يوم القيامة فيقول: من كان يعبد شيئا فليتبعه فيتبع من كان يعبد الشمس الشمس و يتبع من كان يعبد القمر القمر و يتبع من كان يعبد الطواغيت الطواغيت و تبقى هذه الأمة فيها منافقوها " فيأتيهم الله في صورة غير صورته التي يعرفون فيقول: أنا ربكم فيقولون: نعوذ بالله منك هذا مكاننا حتى يأتينا ربنا فإذا جاءنا عرفناه فيأتيهم الله في صورته التي يعرفون فيقول: أنا ربكم فيقولون: أنت ربنا فيتبعونه" و يضرب الصراط بين ظهراني جهنم فأكون أول من يجوز من الرسل بأمته و لا يتكلم يومئذ أحد إلا الرسل و كلام الرسل يومئذ: اللهم سلم سلم و في جهنم كلاليب مثل شوك السعدان غير أنه لا يعلم ما قدر عظمها إلا الله تخطف الناس بأعمالهم فمنهم من يوبق بعمله و منهم من يخردل ثم ينجو حتى إذا فرغ الله من القضاء بين العباد و أراد أن يخرج برحمته من أراد من أهل النار أمر الملائكة أن يخرجوا من النار من كان لا يشرك بالله شيئا ممن يقول لا إله إلا الله فيخرجونهم و يعرفونهم بآثار السجود و حرم الله على النار أن تأكل آثار السجود فيخرجون من النار و قد امتحشوا فيصب عليهم ماء الحياة فينبتون كما تنبت الحبة في حميل السيل ثم يفرغ الله من القضاء بين العباد و يبقى رجل بين الجنة و النار و هو آخر أهل النار دخولا الجنة مقبلا بوجهه قبل النار فيقول: يا رب اصرف وجهي عن النار فقد قشبني ريحها و أحرقني ذكاؤها فيقول: هل عسيت إن فعل ذلك بك أن تسأل غير ذلك فيقول: لا و عزتك فيعطي الله ما يشاء من عهد و ميثاق فيصرف الله وجهه عن النار فإذا أقبل به على الجنة و رأى بهجتها سكت ما شاء الله أن يسكت ثم قال: يا رب ! قدمني عند باب الجنة فيقول الله: أليس قد أعطيت العهد و الميثاق أن لا تسأل غير الذي كنت سألت ؟ فيقول: يا رب لا أكون أشقى خلقك فيقول: فما عسيت إن أعطيتك ذلك أن لا تسأل غيره ؟ فيقول لا و عزتك لا أسألك غير ذلك فيعطى ربه ما شاء من عهد و ميثاق فيقدمه إلى باب الجنة فإذا بلغ بابها فرأى زهرتها و ما فيها من النضرة و

السرور " فيسكت ما شاء الله أن يسكت فيقول: يا رب أدخلني الجنة فيقول الله: ويحك يا ابن آدم ! ما أغدرك ! أليس قد أعطيت العهد و الميثاق أن لا تسأل غير الذي أعطيت ؟ فيقول: يا رب لا تجعلني أشقى خلقك فيضحك الله منه ثم يأذن له في دخول الجنة فيقول: تمن فيتمني حتى إذا انقطعت أمنيته قال الله تعالى: زد من كذا و كذا أقبل يذكره ربه حتى إذا انتهت به الأماني قال الله عز و جل: لك ذلك و مثله معه.

( حم ق ) عن أبي هريرة وأبي سعيد لكنه قال: وعشرة أمثاله.

**٨٢٩٣- ئايا گومانتان هەیە لە بینینی مانگی چواردە کاتێك هەور بە ئاسمانەوەنەبێت؟ ئایا گومانتان هەیە لە بینی نی خۆر کاتێك هەور بەری نەگرتبێت ؟ ئێوەش ئاوا پەروەردگارتان دەبینن ،خوای گەورە خەڵکی کۆ دەکاتەوە و ،دەفەرموێت : هەرکەسێك شتێکی پەرستوە با شوێنی بکەوێت ،ئیتر ئەوەی خۆری پەرستوە شوێن خۆر دەکەوێت و ، ئەوەی مانگی دەپەرستوە شوێن مانگ دەکەوێت و،هەرکەسیش ئەو بتانەی ((تاغوتەکانی)) دەپەرست شوێنیان دەکەوێت و ،ئەم ئوممەتەش تەنها دوورووەکانی تیا دەمێنێتەوە ،ئیتر خوای گەورەیش دێتە لایان بە شێوەیەك جگە لەو شێوەیەی کە دەیناسنەوە ،دەفەرموێت : من پەروەردگارتانم ،ئەوانیش دەڵێن : پەنا بە خوای گەورە دەگرم لە تۆ ،ئەمە جێگای ئێمەیە تاکو پەروەردگارمان دێتە لامان ،جا ئەگەر بێتە لامان دەیناسینەوە ،ئینجا خوای گەورە لەو شێوەدا دێت کە دەیناسن و ، دەفەرموێت : من پەروەردگاری ئێوەم ،ئەوانیش دەڵێن : تۆ پەروەردگاری ئێمەی و ،ئەوانیش شوێنی دەکەون ،ئینجا پردەکە لێ دەدرێت لەسەر دۆزەخ ،من یەکەم کەس دەبم لە پێغەمبەران کە بە ئوممەتەکەمەوە تێدەپەڕم ، ،لەو ڕۆژەشدا پێغەمبەران نەبێت کەس بۆی نیە قسە بکات ،قسەی پێغەمبەرانیش لەو ڕۆژەدا هەر ئەوەیە دەڵێن : خوایە سەلامەتی خوایە سەلامەتی ،لە دۆزەخیشدا قولاپ هەیە لە وێنەی دڕکی سەعدان کەسیش جگە لە خوای گەورە ئەندازەی گەورەیی دۆزەخ نازانێت چەندەیە ؟ دۆزەخ بە گوێرەی کردەوەکانیانەوە خەڵکی دەفڕێنێت ،جا هەندێکیان تیا دەچن بە کردەوەکانیان ،هەندێکیشیان ڕزگاریان دەبێت ،تاکو خوای گەورە لە داوەری دەبێتەوە لە نێوان بەندەکانیدا و ، ئینجا دەیەوێت بە میهرەبانی خۆی ئەوان لە دۆزەخ دەربێنێت کە دەیەوێت ،فەرمان دەکات بە فریشتەکان هەرکەسێك لەوانەی دەڵێن** ( لاإله إلا الله ) و **هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار**

نەداوە ،لە دۆزەخ دەریان بهێنن ،ئەوانیش دەریان دەهێنن و ، بە شوێنەواری سوژدە بردنیان دەیانناسنەوە ،خوای گەورەیش قەدەغەی کردووە لە سەر ئاگری دۆزەخ کە شوێنەواری سوژدە بردن بخوات ،ئیتر لە دۆزەخ دەردەچن لە کاتێکدابە تەواوی سووتاون، ئینجا ئاوی ژیانیان بەسەردا دەرژێن و ەکسەر سەوز دەبنەوە وەکو توێی سەوزە لە قوڕاوی لافاودا ،ئینجا خوای گەورە لە دادوەری نێوان بەندەکان دەبێتەوەو ، پیاوێك لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دەمێنێتەوە کە ئەوە دواترین خەڵکی دۆزەخە کە دەچێتە بەهەشتەوە ،بەلاّم ڕووی هەر بەرەو دۆزەخەو دەڵێت : ئەی پەروەردگارم ڕووخسارم بپارێزە لە دۆزەخ بە ڕاستی بۆنەکەی وەرزی کردم و ،کڵپەکەی سووتاندمی ، پێی دەفەرموێت : ئایا پێت وایە ئەگەر تووشی ئەوە ببیت داوای شتی تربکەیت ؟ دەڵێت : نەخێر سوێند بە شکۆداریت ،ئینجا بەڵێن و پەیمانێکی زۆر بە خوای گەورە دەدات ، خوای گەورە ڕووخساری لە دۆزەخ وەردەگێڕێت ،جا کە ڕووی وەردەگێڕێت بەرەو بەهەشت و خۆشی و دیمەنە دڵفڕێنەکانی دەبینێت ،بێ دەنگ دەبێت ئەوەندە خوا بیەوێت ،ئینجا دەڵێت : ئەی پەروەردگارم نزیکم بکەرەوە لە دەرگای بەهەشت ،جا خوای گەورە دەفەرموێت : ئایا بەڵێن و پەیمانی ڕاستت نەدا داوای هیچی تر نەکەیت ؟ دەڵێت : ئەی پەروەردگار با نەبمە بەدبەخترین دروستکراوەکانت ،دەفەرموێت : باشە ئەگەر ئەوەت پێ بدەم ئیتر داوای هیچی ترم لێ ناکەیت ؟ دەڵێت : نەخێر ،سوێند بە شکۆداریت داوای هیچی ترت لێ ناکەم ،ئینجا پەیمان و بەڵێنی زۆر دەداتە خوای گەورە و ،ئەویش نزیکی دەکاتەوە لە دەرگای بەهەشت ،کاتێك دەگاتە دەرگای بەهەشت و خۆشیەکان و گوڵ و گوڵزارەکانی ناوی دەبینێت ،ماوەیەك بێدەنگ دەبێت کە هەر خوای گەورە دەزانێت چەندەیە و ،ئینجا دەڵێت : ئەی پەروەردگارم بم خەرە بەهەشتەوە ،خوای گەورە دەفەرموێت : بەلاّم[1] لێتدا ئەی ئادەمیزاد چەندە ناپاکی ! ئایا بەڵێن و پەیمانت نەدا داوای شتی تر نەکەیت ؟ دەڵێت : پەروەردگار مەمکە بە بەدبەخترین دروستکراوەکانت ،ئیتر خوای گەورە پێی پێدەکەنێت ئینجا مۆڵەتی دەدات بچێتە بەهەشتەوەو ، پێی دەڵێت : خۆزگە بخوازە ،ئەویش هەتا دەتوانێت خۆزگە دەخوازێت ،ئینجا خوای گەورە

---

[1] وشەی ( وَیح ) وشەیەکە بۆ توڕەبوون بەکاردێت ، هەر وەکو بۆ بەزەیی وسك پێ سوتانیش بەکاردێت . قاموسی ڕستە ج٤ ص ٣٠٨١ .

**پێی دەفەرموێت : ئەوەو ئەوەیش زیاد بکە ،خوای گەورە بیری دەخاتەوە ،تاکو ئاواتی نامێنێت ،ئەو کاتە خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوەندەو ئەوەندەیش لەگەڵیدا بۆ تۆ بێت.**

( المشكاة ٥٥٨١ )

٨٢٩٤- لا تزال جهنم يلقى فيها و تقول: ( هل من مزيد حتى يضع فيها رب العزة قدمه فينزوي بعضها إلى بعض و تقول: قط قط و عزتك و كرمك و لا يزال في الجنة فضل حتى ينشئ الله لها خلقا آخر فيسكنهم في فضول الجنة ) .

( حم ق ت ) عن أنس.

**٨٢٩٤- بەردەوام دۆزەخ هەر تێی فڕێ دەدرێت و ،دەڵێت : ( هل من مزيد[1] ) { ق : ٣٠ } تاکو خوای شکۆدار پێی دەخاتە ناوی ئیتر یەکدێتەوەو دەڵێت : هەرگیزاو هەرگیز ، سوێند بە شکۆ داریت و بەخشندەییت ،لە بەهەشتدا هەر زیادە دەمێنێتەوە ،تاکو خوای گەورە کەسانێکی تری بۆ دەهێنێت و،نیشتەجێیان دەکات لە شوێنە زیادەکانی بەهەشتا.**

( السنة ٥٣١ )

٨٢٩٥- يد الله ملأى لا يغيضها نفقة سحاء الليل و النهار أرأيتم ما أنفق منذ خلق السموات و الأرض ؟ فإنه لم يغض ما في يده و كان عرشه على الماء و بيده الميزان يخفض و يرفع.

( حم ق ت ه ) عن أبي هريرة.

**٨٢٩٥- دەستی خوا پڕە ،بەخشین لێی کەم ناکاتەوە ،بە شەو بە ڕۆژ لێی دەبەخشێت و هەڵدەبژێرێ ،ئایا دەزانن چەندی بەخشیوە لەو ڕۆژەوەکە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ؟ ئەوەی لە دەستیدایە هەر کەمی نەکردووە ،عەرشەکەشی لەسەر ئاو بووەو ،تەرازویشی بەدەستە نزم دەکاتەوە و بەرز دەکاتەوە .**

( السنة ٧٨٠ )

٨٢٩٦- يضحك الله إلى رجلين يقتل أحدهما الآخر يدخلان الجنة يقاتل هذا في سبيل الله فيقتل ثم يتوب الله على القاتل فيسلم فيقاتل في سبيل الله فيستشهد.

( حم ق ن ه ) عن أبي هريرة.

**٨٢٩٦- خوای گەورە پێدەکەنێت بە دوو پیاو یەکێکیان ئەوەکەیان دەکوژێت و ، هەردوکیشیان دەچنە بەهەشت ،ئەوەیان لە پێناو خوادا شەڕ دەکات و دەکوژرێت ،ئینجا**

---

[1] دەڵێ ئایا زیاتر هەیە واتە ئیترم بۆ بێنن .

**خواى گەورە تەوبەى بكوژەكە وەردەگرێت و ،موسڵمان دەبێت و لە پێناو خوادا دەجەنگێت و شەهيد دەبێت .**

( الصحيحة ١٠٧٤ )

٨٢٩٧- ليس أحد أحب إليه المدح من الله و لا أحد أكثر معاذير من الله.

( طب ) عن الأسود بن سريع.

**٨٢٩٧- كەس ئەندەزەى خواى گەورە ستايشى پێ خۆش نييە ،كەسيش نييە ئەوەندەى خواى گەورە پاساو بيانو ناهێنێتەوە بۆ بەندەكانى.**

( الصحيحة ٢١٨٠ )

٨٢٩٨- يا أبا رزين ! أليس كلكم يري القمر ليلة البدر مخليا به ؟ فإنما هو خلق من خلق الله فالله أجل و أعظم.

( حم د ه ك ) عن أبي رزين.

**٨٢٩٨- ئەى ( ابا رزين ) ! ئايا هەمووتان لە وشەى چواردەدا مانگ نابينن كە ئاسمان خاڵى بێت ؟ ئەوە يەكێكە لە دروستكراوەكانى خواى گەورە ،جا خواى گەورە گەورەترو مەزنترە .**

٨٢٩٩- يتجلى لنا ربنا ضاحكا يوم القيامة

( طب ) عن أبي موسى

**٨٢٩٩- خواى گەورە بۆمان بە پێكەنينەوە خۆيمان نيشان دەدات[1] لە ڕۆژى قيامەتدا .**

( الصحيحة ٧٥٥ )

٨٣٠٠- أما إن ربك يحب المدح.

( حم خد ن ك ) الأسود بن سريع .

**٨٣٠٠- بەڵێ پەروەردگارتان حەزى لە ستايش كردنە .**

( الصحيحة ٣١٧٩ )

---

**[1] ئەهلى سوونەت سيفەتى پێكەنين جێگير دەكەن بۆ خواى گەورە وەكو هەموو سيفەتەكانى ترى بە بێ شێواندن و ( تأويل )كردن و لێچوواندن .**

## بابەتی وریاکردنەوە لە هاوبەش دانان بۆ خوا

٨٣٠١- اجتنبوا السبع الموبقات: الشرك بالله و السحر و قتل النفس التي حرم الله إلا بالحق و أكل الربا و أكل مال اليتيم و التولي يوم الزحف و قذف المحصنات المؤمنات الغافلات.

( ق د ن ) عن أبي هريرة .

**٨٣٠١- خۆتان لە حەوت تاوانە لە ناو بەرە کان بپارێزن : هاوبەش بۆ خوادانان و ، جادوو بەناهەق ،کوشتنی ئەو کەسەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە و ،خواردنی سوو و ،خواردنی ماڵی هەتیو و ،هەڵهاتن لە ڕۆژی جەنگ و ،بوختان کردن بۆ ئافرەتە بڕوادارە داوێن پاك و بێ ئاگاکان .**

( ألاارواء ١٢٠٢ )

٨٣٠٢- اجتنبوا الكبائر السبع: الشرك بالله و قتل النفس و الفرار من الزحف و أكل مال اليتيم و أكل الربا و قذف المحصنة و التعرب بعد الهجرة.

( طب ) عن سهل بن أبي حثمة .

**٨٣٠٢- خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانە گەورەکان : هاوبەش بۆ خوادانان و ،کوشتنی مرۆڤ و ،هەڵهاتن لە ڕۆژی جەنگ و ،خواردنی ماڵی هەتیو و ،خواردنی سوو ، بوختان کردن بۆ ئافرەتی داوێن پاك و ،بیابان نیشینی لە پاش کۆچکردن .**

( الصحيحة ٢٢٤٤ )

٨٣٠٣- اعبد الله لا تشرك به شيئا و أقم الصلاة المكتوبة و أد الزكاة المفروضة و حج و اعتمر و صم رمضان و انظر ما تحب للناس أن يأتوه إليك فافعله بهم و ما تكره أن يأتوه إليك فذرهم منه.

( طب ) عن أبي المنتفق .

**٨٣٠٣- خوای گەورە بپەرستەو هاوبەشی بۆ بڕیار مەکە ،زەکاتی پێویست کراویش بدەو، حەج و عومرە بکەو ،ڕەمەزان بە ڕۆژووبەو ،تەماشایش بکە بزانە حەز دەکەیت خەڵکی چیت بۆ بکەن تۆش هەر ئەوەیان لەگەڵ بکە ،ئەوەیشی پێت ناخۆشە لەگەڵت بیکەن ، تۆیش ئەوەیان لەگەڵ مەکە .**

( الصحيحة ١٤٧٤ )

٨٣٠٤- اعبد الله و لا تشرك به شيئا و اعمل لله كأنك تراه و اعدد نفسك في الموتى و اذكر الله تعالى عند كل حجر و كل شجر و إذا عملت سيئة فاعمل بجنبها حسنة السر بالسر و العلانية بالعلانية.

( طب هب ) عن معاذ بن جبل .

**٨٣٠٤- خوای گەورە بپەرستەو هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە ،کردەویش بۆ خوای بکە وەکو چۆن ببیبینیت ،خۆشت لە مردووان بژمێرە ،یادی خوای گەورەیش بکە لای هەموو بەردو دارێك ،کاتێك خراپەیەکیش دەکەیت ،لە تەنیشتیدا چاکەیەك بکە ،پەنهان بە پەنهانە و ،ئاشکرا بە ئاشکرا .**

( الصحيحة ١٤٧٥ )

٨٣٠٥- إن الله أمر يحيى بن زكريا بخمس كلمات أن يعمل بهن و أن يأمر بني إسرائيل أن يعملوا بهن فكأنه أبطأ بهن فأوحى الله إلى عيسى: إما أن يبلغهن أو تبلغهن فأتاه عيسى فقال له: إنك أمرت بخمس كلمات أن تعمل بهن و تأمر بني إسرائيل أن يعملوا بهن فإما أن تبلغهن و إما أن أبلغهن فقال له: يا روح الله إني أخشى إن سبقتني أن أعذب أو يخسف بي فجمع يحيى بني إسرائيل في بيت المقدس حتى امتلأ المسجد فقعد على الشرفات فحمد الله و أثنى عليه ثم قال: إن الله أمرني بخمس كلمات أن أعمل بهن و آمركم أن تعملوا بهن " و أولهن: أن تعبدوا الله و لا تشركوا به شيئا فإن مثل من أشرك بالله كمثل رجل اشترى عبدا من خالص ماله بذهب أو ورق ثم أسكنه دارا فقال: اعمل و ارفع إلي فجعل العبد يعمل و يرفع إلى غير سيده فأيكم يرضى أن يكون عبده كذلك ؟ و إن الله خلقكم و رزقكم فاعبدوه و لا تشركوا به شيئا و أمركم بالصلاة و إذا قمتم إلى الصلاة فلا تلتفتوا فإن الله عز و جل يقبل بوجهه على عبده ما لم يلتفت " و أمركم بالصيام و مثل ذلك كمثل رجل معه صرة مسك في عصابة كلهم يجد ريح المسك و إن خلوف فم الصائم أطيب عند الله من ريح المسك " و أمركم بالصدقة و مثل ذلك كمثل رجل أسره العدو فشدوا يديه إلى عنقه و قدموه ليضربوا عنقه فقال لهم: هل لكم أن أفتدي نفسي منكم ؟ فجعل يفتدي نفسه منهم بالقليل و الكثير حتى فك نفسه و أمركم بذكر الله كثيرا و مثل ذلك كمثل رجل طلبه العدو سراعا في أثره فأتى حصنا حصينا فأحرز نفسه فيه و إن العبد أحصن ما يكون من الشيطان إذا كان في ذكر الله تعالى . و أنا آمركم بخمس أمرني الله بهن: الجماعة و السمع و الطاعة و الهجرة و الجهاد في سبيل الله فإنه من فارق الجماعة قيد

شبر فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه إلا أن يراجع و من دعا بدعوة الجاهلية فهو من جثاء جهنم و إن صام وصلى و زعم أنه مسلم فادعوا بدعوة الله التي سماكم بها المسلمين المؤمنين عباد الله.

( حم تخ ت ن حب ك ) عن الحارث ابن الحارث الأشعري .

**٨٣٠٥- خوای گەورە فەرمانی د بە یەحیای کوڕی زەکەریيا کردوە کار بە پێنج ووتە بکات و فەرمان بە بەنی ئیسرائیل بکات ئەوانیش بیکەن ،ئەویش وەکو چۆن بڵێیت سستی نواند ،ئیتر خوای گەورە وەحی نارد بۆ عیسا : یان ئەو ڕایگەیەنێت ،یان تۆ ڕایگەیەنە، عیسا هاتە لای و پێی وت : تۆ فەرمانت پێکراوە پێنج شت ئەنجام بدەیت و فەرمان بە بەنی ئیسرائیل بکەیت ئەنجامی بدەن، جا یان ئەوە ڕابگەیەنەو ،یان من ڕایدەگەیەنم، پێی وت : ئەی ڕۆحی خوا دەترسم ئەگەر پێشم بکەویت سزا بدرێم و ،یان ببرێم بە ناخی زەویدا،ئیتر یەحیا بەنی ئیسرائیلی کۆکردەوەو لە بەیتولمقدیسدا تاکو مزگەوتەکە پڕ بوو ،ئینجا لەسەر بەرزاییەکدا دانیشت و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و ،فەرمووی: خوای گەورە فەرمانی پێکردووم بە پێنج ووتە کاری پێبکەم و، فەرمان بە ئێوەیش بکەم کاری پێ بکەن ،یەکەمیان ئەوەیە کە خوا بپەرستن و ،هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەکەن ،چونکە نمونەی ئەو کەسەی هاوبەش دادەنێت ، نموونەی کەسێکە کۆیلەیەك بکڕێت لە ماڵی خۆی لە ئاڵتوون یان لە زیو ،ئینجا لە خانوویەکەی خۆیدا نیشتە جێی بکات و، پێی بڵێت : کار بکەو ئینجا بۆم بەرز بکەرەوە ،بەڵام ئەو کۆیلەیە کاری دەکردوو ،دەیدایە کەسێکی تر جگە لە گەورەکەی جا کامتان ڕازی دەبن کۆیلەکەتا وابێت ؟ خوای گەورەیش ئێوەی دروستکردووە و ،ڕۆزی پێتان داون ،ئێوەیش بیپەرستن ،هیچ هاوەڵێکی بۆ پەیدا مەکەن ،ئینجا فەرمانتان پێدەکەم بە نوێژ کردن ،کاتێك هەڵدەستن بۆ نوێژ ئاوڕ مەدەنەوە ،چونکە خوای گەورە بە ڕووی بە ڕووی بەندەکەیەتی تائەو کاتەی ئەو ڕووی وەردەگێڕێت ،هەروەها فەرمانتان پێدەکەم بە ڕۆژوو گرتن ، نموونەی ئەو کەسەیش نموونەی پیاوێکە کیسەیە میسکی پێبێت لە ناو کۆمەڵێکدا هەموویان هەست بە بۆنی خۆشی دەکەن،بۆنی دەمی ڕۆژووەوانیش لەلای خوای گەورە لە بۆنی گوڵاو خۆشترە ،فەرمانیشتان پێدەکەم بە خێر و بەخشین ، نموونەی ئەوەیش نموونەی پیاوێ کە دوژمن دیلی کردووە و ،دەستیان بەستووە بە گەردنیەوە و ، پێش خۆیان داوە بۆ ئەوەی لە گەردنی بدەن ،ئەویش پێیان دەڵێت : ئایا دەکرێت**

**خوێنبایی خۆم بدەم بە ئێوەو ئازادم بکەن ؟ ئینجا بە زۆرو بە کە خوێنبایی خۆی پێدان و ،خۆی ڕزگارکرد ،هەروەها فەرمانتان پێدەکەم یادی خوا زۆر بکەن ، نموونەی ئەوەش نموونەی پیاوێکە دوژمن بەهەڵە داوان بەدوایدا بگەڕێن و ،ئەویش چووبێتە قەڵایەکی قایم و خۆی تیا حەشار دابێت ،بەندەیش بە باشترین شێواز پارێزراو دەبێت لە شەیتان کاتێك سەرقاڵی یادی خوای گەورە دەبێت ،هەروەها فەرمانتان پێدەکەم بە پێنج شت کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووم : کۆمەڵی موسڵمانان و بیستن و گوێڕایەڵی و ،کۆچکردن و ،جیهاد لە پێناوی خوادا ،چونکە هەرکەسێك بستێك لە کۆمەڵی موسڵمانان دابڕێت، لە ئیسلام دەردەچێت ،مەگەر واز لەو کارەی بهێنێت بگەڕێتەوە ،هەرکەسێکیش بە بانگەوازی نەفامی بانگەواز بکات دەبێتە نیشتە جێی دۆزەخ با نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێت و بانگەشەی ئەوەبکات کە موسڵمانە ،بۆیە بەو ناو و بانگەوازەی خواوە بانگەواز بکەن کە ناوی موسڵمان و بڕواداری لە ئێوە ناوە ئەی بەندەکانی خوا .**

( صحيح الترمذى ٢٨٦٣ )

٨٣٠٦- إنه لا يدخل الجنة إلا نفس مسلمة و إن الله ليؤيد هذا الدين بالرجل الفاجر.

( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٨٣٠٦- بەڕاستی هەرکەس مسوڵمان نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە ، وە بەڕاستی خوای گەورەش هەر پاڵپشتی ئەم ئایینە دەکات بە پیاوی خراپەکاریش بێت .**

( الصحيحة ١٦٤٩ )

٨٣٠٧- قال الله تعالى: أنا أغنى الشركاء عن الشرك من عمل عملا أشرك فيه معي غيري تركته و شركه.

( م ه ) عن أبي هريرة

**٨٣٠٧- خوای گەورە دەفەرموێت : من بێ نیازترین هاوبەشەکانم لە هاوبەش ، هەرکەسێك کردەوەیەك بکات و کەسێکی ترم لەگەڵدا بەشدار بکات ، من وازی لەخۆی و هاوبەشەکەی دێنم .**

( الترغيب ٣٤ )

٨٣٠٨- كل ذنب عسى الله أن يغفره إلا من مات مشركا أو قتل مؤمنا متعمدا.

( د ) عن أبي الدرداء ( حم ن ك ) عن معاوية.

**٨٣٠٨- هەموو گوناهێك لەوانەیە خوای گەورە لێی خۆش بێت ، تەنها كەسێك نەبێت لەسەر بە هاوبەش دانەری مردبێت یان كەسێكی بەناهەق كوشتبێت .**

( الصحيحة ٥١١ )

٨٣٠٩- الكبائر: الإشراك بالله و قذف المحصنة و قتل النفس المؤمنة و الفرار يوم الزحف و أكل مال اليتيم و عقوق الوالدين المسلمين و إلحاد بالبيت قبلتكم أحياء و أمواتا.

( هق ) عن ابن عمرو.

**٨٣٠٩- تاوانە گەورەكان : هاوبەش بۆ خوا بڕیاردان و، بوختان كردن بۆ ئافرەتی داوێن پاك و ، كوشتنی بڕوادار و، هەڵهاتن لە ڕۆژی هێرشبردندا و ، خواردنی ماڵی هەتیو و ، خراپە كردن لەگەڵ دایك و باوكی مسوڵمان و ، لادان لە حەق لەلای ماڵی خوادا كە ڕووگەتانە بە زیندوویی و بە مردوویی .**

( ألارواء ٦٩٠ )

٨٣١٠- الكبائر تسع: أعظمهن إشراك بالله و قتل النفس بغير حق و أكل الربا و أكل مال اليتيم و قذف المحصنة و الفرار يوم الزحف و عقوق الوالدين و استحلال البيت الحرام: قبلتكم أحياء و أمواتا.

( د ن ) عن عمير.

**٨٣١٠- گوناهە گەورەكان نۆ دانەن : گەورەترینیان هاوبەش بۆ خوا بڕیاردانە و ، كوشتنی ناهەق و ، خواردنی ماڵی هەتیو و، بوختان كردن بۆ ئافرەتی داوێن پاك و ، هەڵهاتن لە ڕۆژی جەنگ و هێرشدا ، خراپە كردن لەگەڵ دایك و باوك و ، خراپە كاری، لە ماڵی خوادا كە ڕووگەتانە بە زیندوویی بە مردوویی .**

( ألارواء ٦٩٠ )

٨٣١١- الكبائر سبع: الإشراك بالله و قتل النفس التي حرم الله إلا بالحق و قذف المحصنة و الفرار من الزحف و أكل الربا و أكل مال اليتيم و الرجوع إلى الأعرابية بعد الهجرة

( طس ) عن أبي سعيد

**٨٣١١- تاوانە گەورەكان حەوتن : هاوبەش بۆ خوا بڕیاردان و ، كوشتنی ئەو گیانەی كە خوای گەورە قەدەغەی كردووە ، بە مافی خۆی نەبێت و ، بوختان كردن بۆ ئافرەتی داوێن پاك و ، هەڵهاتن لە ڕۆژی جەنگ و ، خواردنی سوو و ، خواردنی ماڵی هەتیو و ، گەڕانەوە بۆ بیابانشینی پاش كۆچكردن .**

( الترغيب ٣٥٤٠ )

٨٣١٢- لا تشرك بالله شيئا و إن قطعت و حرقت و لا تترك صلاة مكتوبة متعمدا فمن تركها متعمدا فقد برئت منه الذمة و لا تشرب الخمر فإنها مفتاح كل شر.

( ه ) عن أبي الدرداء.

**٨٣١٢- هاوەڵ بۆ خوا بڕیار مەدەن ئەگەر لەت لەتیش بکرێیت یان بسوتێنرێیت ، بەهیچ شێوەیەکیش نوێژی فەرزت بە ئەنقەست نەفەوتێنی ، چونکە هەرکەس ئەو کارە بکات پەیمانی لەگەڵ خوا نامێنێ ، عارەقیش مەخۆ چونکە کلیلی هەموو خراپەیەکە**

( ألارواء ٢٠٨٦ )

*** سوپاس بۆ خوای گەورە ئەم کتێبە تەواو بوو لە ٢٦ /شعبان / ١٤٢٦ داوا کارم لە خوای گەورە بیکاتە مایەی سوودو تەنها لە پێناوی ئەودا بووبێت .**

**عصام موسی هادی**

**عمان-الاردن**

*** وەرگێڕانی ئەم کتێبە پیرۆزە تەواو بوو لە پاش نوێژی بەیانی رۆژی پێنج شەممە ٢٣/رجب / ١٤٣٠ بەرانبەر ٢٠٠٩/٧/١٦ ، داواکارم لەخوای بالاّ دەست و میهرەبان بیکاتە مایەی سوود بۆ مسوڵمانان و ئەوانیش ، بێ بەشم نەکەن لە پاڕانەوە و ، نزای چاکەیان .**

**احسان برهان الدين**

**كلار – العراق**

**- سوپاس بۆ خوا لە چێشتەنگاوی رۆژی عەرەفە کە بەرامبەرە لەگەڵ رۆژی شەممە /ذي الحجة/١٤٣٢ کۆچی و رێکەوتی ٢٠١١/١١/٥ پیاچوونەوە و هەڵەچنی ئەم کتێبەم تەواوکرد ئومێەوارم ببێت چرای ڕوناك بۆ دونیاو دواڕۆژی من و هەموو موسڵمانێکی ڕەسەنی کورد زمان .**

**مەلا ئەحمەدی شەریعە**

**سلێمانی // مجید بگ**

# پێرستی بابەتەکان